« سنوور و کەوشەنی زمانی خۆماڵکردن دەبێ تا کوێ بچێ»ی بەمچەشنــە وەڵامی دەدایەوە : «وشەگەلێکی زۆر کە لە ڕەگەمای زمانی تورکی نــین و لە سەردەمی ژیانی ڕەوەندایەتی‌یەوە کەوتوونە زمانەکەوە و تائێستاش هەر بەکاردەهێندرێن پێی ناوێ وشەی تورکی‌یان لەجیاتی بۆ بدۆزینەوە . هەر وشێکی بووبێ بە مــاڵی زمانی خەڵك و بووبــێ بــە تورکی پێویستــە بیسێنێتەوە »[٤٦] .

بێ‌گومان فڕێدانی وشەگەلی وەکو «کلام» ، «کاغت» ، «کتاب» ، «مکتوب»و ئی دیکە لە زمان ، کە سەدان ساڵە بەسەر زاری خەڵکەوەن هیچ قازانج و سوودێك بە زمانەکە نابەخشێ . ئەوانەی لەم بەرەیە بوون لەدژی لە نوێژەن زیندوو کردنەوەی وشی مردوو بوون . تەسوییەچی‌یەکان لەپاش ئەوەی وشە بیانی‌یەکانیان لە زمان دەراویشت ، شوێنە چۆڵەکانیان بە وشی زمانەکانی ئاسیای ناوەند پڕدەکردەوە . بەڵام ئەم کارە دیسانەوە زمــانەکەی تووشی باری نالەبار دەکرد و خەڵك تێیاننەدەگەیشت ، چون ئەو وشانەش هەر بە زمانی خەڵك نامۆ و نائاشنا بوون و لە شانیان گران بوون .

ئەدەبیاتناسی بەناو و بانگ ، ئیسماعیل حەبیب دژی ئەم بارە دەنووسێ :

« ئەو وشانەی کە لە زماندا ، وەکوو ڕووبارێکی بەخوڕ لە سەرینچاوەی بێ سەر و شوێنەوە دێنە خوار ، هیی وەکوو خۆیان لەبری دانەندرێن هیی خۆی نین » [٤٧] .

بەڵام تەسوییەچی‌یەکان لە هەوەڵکۆوە بەگوڕتر بوون .

ئەوساکە لەجیاتیی وشی تورکی لە وشی ئاوها دەگەڕان »[٤٨] .

---

(٤٦) « زمانی تورك » ، ١٩٦٢ ، ب ١١ ، ژ ، ١٣١ ، ل ٨٤ .

(٤٧) ئیسماعیل حەبیب «کێشەی زمان» ، ئەستەمبوول ، ١٩٤٩ . ل ٦٩ .

(٤٨) بڕوانە : « زمانی تورك » ، ١٩٦٢ ، ب ، ١١ ، ژ، ١٣١ ، ل ٨٣٩ .

له ساڵی ١٩٣٥دا د. ر. ه. ف. كڤیرگیچ نامیلكەیەكی له ڤییانەڕا بۆ ك. ئەتاتورك نارد . ئەم كڤیرگیچە لەم نامیلكەیـەدا بنـەڕەتی « تیۆریی خۆرزمان »ی دەچەسپاند .

لەم « تیۆریی خۆرزمان »ەدا ئەم بیر و بڕوایە دەردەبڕدرا : « زمـانی تورك ئەو زمانە لەمێژینە و گەورە و شارستانی‌یەیە كە لە دەوری بـەردا زاراوەكانی شارستانێتیی بەهۆی ژیانی كۆچەرایەتی‌یەوە بە زمانانی دیكەدا بڵاودەكردەوە » [٤٩] .

« ئەوانەی تیـۆریی خۆرزمانیـان پەسنـد دەكرد پانتوركیستانـە هەڵوێستیان دەكرد و بەهۆی ئەم تیۆری‌یەوە دەیانویست ئەوە بسەپێنن كە هەر وشێك لە هەر زمانێكدا سەر و شوێنی ڕوون نەبوو و نەدەزاندرا لەكوێڕا سەری هەڵداوە ، ئەوە لە ڕەگەمای زمانی توركیڕا كەوتۆتەوە و تۆرە و سـۆرەی ئـەوە .

لە جێژنی ساڵگەڕی سێ ساڵەی زماندا ی. ن. دیلمەن سەرەكنووسەری كۆمەڵی زمانی تورك دەیگوت : هەروەكوو سەرلەبەری زمانەكانی ئەورووپا لە ڕووی ئێتیمۆلۆژی‌یەوە لە بنەڕەتدا توركین ، هەروەهاش بنەمای ڕەگ و ڕیشەی زمانگەلی عارەبی و عیبرانی و كلدانی و ئاسۆریش ... و... هتد توركی‌یـە ... »

بەپێی سەرینچاوە لەمێژینەكان ڕوون بۆتەوە كە سەرپـاكی زمانـانی شارستانی ڕووی زەوی بە ڕەگ و ڕیشە توركین [٥٠] .

« تیۆریی خۆرزمان » بایی پووشێكی سوود بە زمانی توركی نەبەخشی.

---

(٤٩) ئا. س. لەوەند . سەرچاوەی پێشوو ، ل ٤٣١ .

(٥٠) « زمانی تورك » ١٩٣٥ ، ژ ١٣ ، ل ٩١ .

بەپێچەوانەوە ، بوو بە تەگەرە و بەرهەڵست لەپێش گەشە و پەرەساندنیدا •
« تیۆریی خۆرزمان » بەلای کەسانێکەوە ئەم ئاکامەی بەدەستەوە دا :

پێویست نیە ئەو هەموو وشە زۆر و زەوەندە بیانی‌یانە لە زمانی تورکی وەدەرکرێن ، چون لەوانەیە بە ڕەگ و ڕەگەما تورکی بن •

تەنانەت ئەمانە دەیانگوت ، هەندێ لەو زاراوە زانستی‌یانەی لە زمانە بیانی‌یەکاندا هەن ، پشت بە « تیۆریی خۆرزمان » لەگەڵ زمانی تورکدا هاوپێوەندن و ئاشنای یەکن •

بەنموونە : وشەی « بوتانیکا »یان دەبردەوە سەر «بیتگی» ( گیا = ڕووەك ) وەکو وشەی «سۆسیال»یان دەبردەوە سەر «سۆی» و وشەی «ئەلێکتریك»یان دەبردەوە سەر «ئتراك ، ئلتراك» [٥١] •

ئەم ئاکامە دووبارە لایەنگرانی زمانی عوسمانیی لە نوێژەنرا ورووژاند و ڕاستی‌کردنەوە • گوڕی زمان ساناکردن نیشتەوە و بێ‌هێز بوو • کاری وشی بیانی لە زمان دەراویشتن هەر بەردەوام بوو •

بەڵام نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ ، کە لە ئاکامی پەسندکردنی « تیۆریی خۆرزمان »دا لە تورکیا ، هەڵپە و ڕەنجی بێ‌مانای تەسوییەچی‌یەکان لەپێناوی بووژاندنەوەی وشی مردوودا سەرلەنوێ لە زماندا بەکارهێنانیان پێشی لێ گیرا •

لەم سەردەمەدا کۆمەڵی وردکردنەوەی زمانی تورك وێڕای بێ‌گوڕی و کەم‌هێزی وەنەبێ بەجارێ بڕستی لێ ببڕێ • بەڵکو لە زمان کۆڵینەوە و زمان تۆژینەوە هەر بەردەوام بوو •

بێ‌گومان ، لە تەنیا وتارێکدا گوریسم بەم هەمووەڕا ناگاتەوە • دەبێ

---

(٥١) ئا. س. لەوەند . سەرچاوەی پێشوو . ل ٤٥٢ .

ئەوەش بپێژرێ کە تەسوییەچی‌یەکان ، با لە سەرەتاشدا زۆر چەپڕەویش بووبن ، بەڵام لە مەیانی زمان ساناکردندا سەرکەوتنی زۆریان وەچەنگ کەوت •

ئێمرۆ زمانی ئەدەبیی تورکی ئەو زمانە نالەبار و گلێزە نیە کە خەڵک تێی‌نەگەن و لە شانیان گران بێ • زمانی ئەدەبی ، زمانی چاپەمەنی لە وشەی فارسی و عارەبی ، تەرکیب و ئیزافەی عارەبی و فارسی تاڕادەیەك چاك خاوێن بۆتەوە •

# لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی لە عێراقدا

**دوکتۆر ك. ك. کوردۆیێف**
**نووسیویەتی (١)**
**دوکتۆرە شوکرییە ڕەسووڵ**
**( کۆلێژی ئەدەبیات ـ زانکۆی سلێمانی )**
**لەگەڵ هەندێ دەسکاری‌کردنی پێویستدا**
**کردویە بە کوردی**

لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی لە عێراقدا پێوەندە بە دەرکەوتنی قۆناغی چاپەمەنی‌یەوە (١٨٩٨) [٢] . دەرکەوتنی ئەم قۆناغە بوو بە هۆی پێشکەوتنی ڕۆشنبیرانی‌کورد . ئێمە ئەتوانین لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی بەسەر سێ قۆناغدا دابەش‌بکەین :

---

(١) ئەم وتارە لە لاپەڕە ١٤٣ تا ١٥٥ی ژمارە ٢ی ساڵی ١٩٧٥ی گۆڤاری « گەلانی ئاسیاو ئەفەریقا »دا بڵاوکراوەتەوە ـ وەرگێڕ .

(٢) بە ڕای من ڕاستە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی لە عێراقدا پێوەندە بە دەرکەوتنی قۆناغی چاپەمەنی‌یەوە ، بەڵام چاپەمەنی لە عێراق خۆیدا ، نەك تێکڕای چاپەمەنیی کوردی . بۆیە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانەوە دەست‌پێ‌ئەکات کە ئەوەبوو جەمالەددین بابان لە شوباتی ١٩١٤وە گۆڤاری (بانگ کرد ـ بانگی کورد)ی دەرکردو پاش ئەوەش داگیرکەرە ئینگلیزەکان ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی)یان دەرکرد .

**قۆنـاغی یـەکەم :**

لە کۆتاییی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەوە تا شۆڕشـی سۆشیالیستیی ئۆکتۆبەرو سالآنی بیست درێژەی کێشا [٣] • لەم‌سالآنـەدا لە گۆڤارەکـانی « کوردسـتـان » « ١٨٩٨ ــ ١٨٩٩ »و « ڕۆژی کـورد » « ١٩١١ ــ ١٩١٢ »و «بانگی کورد» (١٩١٣ ــ ١٩١٩)و « پێشـکەوتن » (١٩١٧ ــ ١٩٢١) [٤]دا ، کۆمەڵە شیعرو نووسینی ئەو شاعیرو نووسەرانە

---

ئەم ڕۆژنامەیە کە لـە سـالآنی جەنگ‌و پاش داگـیرکردنی بـەغدادا دەرئەچوو ، گەلێ نموونەی شیعری کوردی‌و لێکۆڵینـەوەی شـیعرو شاعیرانی کوردی تیایە ( بڕوانە : دوکتـۆر کەمـال مەزهەر ئەحمـەد ، « تێگەیشتنی ڕاستی‌و شوێنی لە مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا » ، بەغدا ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، ١٩٧٨ ) ــ وەرگێڕ •

(٣) من لام‌وایە ئەبێ دابەش‌کردنی قۆناغەکانی لێکۆڵینەوەو بلآوکردنەوە ( نەك تەنها لێکۆڵینەوە)ی ئەدەبی کوردی لە عێراقدا بەم‌جۆرە بێ : قۆنـاغی یەکەم لە جەنگی یەکەمی جیهانەوە تا سالآنی ٣٠ • قۆناغی دووهەم لـە سالآنی سی‌یەوە تا شۆڕشی ١٤ی تەمووز • قۆناغی سێهەم لە شۆڕشی ١٤ی تەمووزەوە تا سالی ١٩٧٠ • لەو سالەشەوە قۆناغێکی نوێ دەستی پێ‌کردوە کە هێشتا بەتەواوی نەمەییوەو مـۆرکی خـۆی بـە ڕوونـی دەرنەخستووە • مەبەستم لەم جۆرە دابەش‌کردنە ئەوەیە ئەو گۆڕانانـە دەرببڕم کە بەسەر ئەدەبی کوردیدا هاتوون لە عێراقدا کە بەم‌جۆرەی من پێشنیارم کرد باشتر دەرئەخرێ • ئەگینا لـە دەرچـوونی ڕۆژنـامەی (کوردستان)ەوە لە ١٨٩٨دا تا دەرچوونی (بانگی کورد) بەڵکو تا دەرچوونی (تێگەیشتنی ڕاسـتی) لە ١٩١٦دا هیـچ نیشانـەیەکی بلآوکردنـەوەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کورد لە عێراقـدا دیـار نی‌یـە • بلآوکردنـەوەو لێکۆڵینەوەی چەند شیعرێکی شاعیرانی کوردی عیراقیش لە هەنـدێ ڕۆژنامەو گۆڤاری ئەستەمووڵدا بایەخێکی ئەوتۆی نی‌یە ــ وەرگێڕ •

(٤) ( ڕۆژی کورد) لە ١٩١٣دا دەرچووەو پاشان ناوی بووە بە (هەتاوی کورد)و هەردووکیان یەکی چەند ژمارەیەکی کەمیان لێ دەرچوو • (بانگی کورد)یش لە ١٩١٤دا دەرچـوو و تەنها چـەند ژمارەیـەکی لـێ بلآوکرایـەوە • (پێشکەوتن)یش لە ١٩٢٠دا دەرچووە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لە سلێمانی (بڕوانە : دوکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد ، « تێگەیشتنی ڕاستی‌و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا » ، بەغدا ١٩٧٨ ) ــ وەرگێڕ •

بڵاوئەکرایەوە کە لەناو ڕۆشنبیرانو خوێندەواراندا زۆر ناسراو بوون [٥] •

**قۆنـاغی دووهەم :**

لەدوای شۆرشی ئوکتۆبەرەوە تا سـالانی سـی [٦] کە سەرەتـای جووڵانەوەی ئازادیبەخشی نیشتمانیو نەتەوەییی میللەتی کورد هەسـتی پێ ئەکراو ئەبینرا • لەم قۆناغەدا گیانی نیشتمانپەروەریی میللەت زیـاتر پەرەیسەند ، بەتایبەتی دوای دامەزراندنی میرنشینیی کوردستانی خـوارووی (١٩١٩ ــ ١٩٢١) دەسکرا بە هەوڵدان کە ئەدەبی کوردی زیاتر کۆبکرێتەوەو شاکاری نووسەرانی ئەو سەردەمەش زۆرتر چاپبکرێت • ئەوەبـوو بـە دەرکەوتنی ئەم گۆڤارانە بەرهەمو چاپەمەنی پەرەیسەند :

«ڕۆژی کوردستـان» (١٩٢٢) ، «دەنـگی حـەق» [٧] (١٩٢٣) ،

---

(٥) نەئەبوو دوکتۆر کوردۆیێف مێـژووی دەرکردنـی ڕۆژنـامەو گۆڤـارو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی تێکەڵی یەك بکا .

ڕاستە گەلێ لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان تێکستی زۆری شیعری کوردییان بڵاوکردووەتەوەو زۆریشیان لەوەش بەولاوە لێکۆڵینەوەشیان لەسـەر ئەدەبی کوردی بڵاوکردووتەوەو ئێستاش هەروانو هێشتا ڕۆژنامـەو گۆڤارەکان بەدەرەتانترین مەیدانی بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوەن لەسـەر ئەدەبی کورد ، بەڵام هێشتا مێژووی دەرچوونی ڕۆژنامە یا گۆڤار نابێ بە سەرەتای مێژووی بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوە لەسەر ئەدەبی کوردی ، بەتایبەتی کە ئەزانین ئەم لێکۆڵینەوانە ٢٠ ساڵێك پاش دەرچوونی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی دەستکرا بە بڵاوکردنەوەیانو تا گۆڤـاری گـەورەو باشیش لە ژیانی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا پەیدا نەبوو ، جێی خـۆی بەتەواوی نەگرت ــ وەرگێڕ .

(٦) ڕاستەکەی ئەو کارەی کە ئەبوو شۆڕشی ئوکتۆبەر لە ئەدەبی کوردیـدا بیکا ، لە ساڵانی سییەوە سەرەتای دیاریی دا٠ ڕاستە هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە تاڕادەیەك کاری شۆڕش بە ژیانی سیـاسیی کوردستـانی عێراقەوە دەرکەوت ، بەڵام بە ژیانی کولتوورییەوە دەرنەکەوتو تەنهـا لە ساڵەکانیسیدا وردە وردە دەستیکرد بە بڵاوبوونەوە ــ وەرگێڕ .

(٧) دەنگی حەق : ڕاستەکەی (بانگی حەق)ە کە لـە ١٩٢٣دا لـە سلێمـانی دەرچووە ــ وەرگێڕ .

«ژیناقا»[8] (١٩٢٤) ، «ژین» (١٩٢٣)[9] ، گۆڤاری «دەنگی کوردستان»[10] (١٩٢٢ ـ ١٩٢٦)، «دیاری کوردستان» (١٩٢٦) ، «زاری کرمانجی» (١٩٢٦ ـ ١٩٣٢ ) ، « ڕووناکی » ( ١٩٢٧ ) •

لە سالآنی سی‌دا لە هەموو لایەکەوە بە شێوەیەکی فـراوان هـەوڵی بووژاندنەوەی بەرهەمی ئەدەبی‌و وتاری ئەدەبی‌یان لەناو کۆمەلآنی زۆری خەلـکدا داوە •

ئەنجامی ئەو کارو هەوڵو کۆششەش بووە هـۆی دەرکەوتنی گەلێ ڕۆژنامەو گۆڤاری ئەدەبی‌و زانستی‌و کۆمەلآیەتی‌و زمانەوانی • بۆنموونـە لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری « زانستی ئەدەبیات » (١٩٣٨) [11] چەندەهـا وتار چاپکرا کە ڕۆڵی ئەدەبیـان لـەڕووی پـەروەردەکردنی گەنجـانو خۆشەویستیی نیشتمانو بووژاندنەوەی بیرو خەباتیان دژی چەوساندنەوەی میللەت‌و لەپێناوی سەربەخۆیی‌و ئازادیدا پیشان‌ئەدا •

هەر لەو سالآنەدا دەست‌کرا بە چاپکردنی بەشێکی‌تر لە بەرهەمەکانی شاعیرانی کورد وەکو ( دیوانی سالم ) کە لە سالی ١٩٣٣دا چاپکرا • لـە

---

(٨) ژیناقا : ڕاستەکەی (ژیانەوە)یە کە لە ١٩٢٤دا لە سلێمانی دەرچووەو ماوەیەکی زۆر ژیاوە ــ وەرگێڕ •

(٩) ژین لە ١٩٣٩دا دەرچوو . لەنێوان (ژیانەوە)و (ژین)دا (ژیان)یش هەیـە کە لە سالآنی ١٩٢٦ ــ ١٩٣٨دا لە سلێمانی دەرچووەو ٥٥٣ ژمارەی لێ بلآوکراوەتەوە ــ وەرگێڕ •

(١٠) دەنگی کوردستان : ڕاستەکەی ( بانگی کوردستان )ە ــ وەرگێڕ •

(١١) تا ئێستا گۆڤارێکی کوردی بە ناوی (زانستی ئەدەبیات) بلآو نەکراوەتەوە. لەو ماوەیەدا کە خاوەن وتار باسی لێ ئەکات دوو بلآوکراوەی بەنرخ بـە ناوی (دیاری لاوان)و (یادگاری لاوان) بلآوکراوەتەوەو لە ١٩٣٨یشـدا صالح قەفتان گۆڤاری (زانستی)ی لـە سلێـمانی دەرکـردووە کە زۆر نەژیاوە . هەر لەو ماوەیەدا قوتابخانەی (زانستی)یش لـە سولەیمـانی هەبوە ــ وەرگێڕ •

سالی ١٩٣٥یشدا (دیوانی شێخ ڕەزای تالەبانی)و لە سالی ١٩٣٦دا (دیوانی ئەدەب ) چاپکرا [١٢] •

لە هەریەك لــەم کتێبانەدا کە لەچاپدران پێشەکییەكو بەســەرهاتی ژیانی شاعیرەکە لەگەل خاسیەتی گشتیی هونەری خراوەتەڕوو [١٣] •

بەلام بەشێوەیەکی گشتی لێکۆلینەوەی زانستی تاکو ئێستا لەبــارەی ئەو شاعیرانەوە نەکراوە •

لە کۆتاییی سالانی سیدا دوو کۆمەلە شیعری شاعیران چاپکرا • لــە سالی ١٩٣٨دا ( کۆمەلە شیعری شاعیرانی کورد ) لەلایەن عەبدوللا کەریــم خەزازییەوە [١٤] چاپکرا • لە سالی ١٩٣٩یشدا (گول دەستەی شوعەرای هاوعەسرم) لەلایەن عەلی کەمال باپیرەوە چاپکرا • لەم بەرهەمەی دواییدا عەلی کەمال باپیر شیعری شاعیرانی [١٥] هاوچەرخی خۆی چــاپکردووە : (ئەحمەد موختار بەگی جاف ، بێخود ــ مەلا مەحموود ، پیرەمێرد ــ تەوفیق، ساحێبقران ــ ئەحمەدی [١٦] ، نووریی شێخ سالح ) •

**قۆنــاغی سێهەم :**

لێکۆلینەوەی ئەدەبی کوردی لە سالانی (٤٠)ەوە دەستیپیکرد • لــە

---

(١٢) دیوانی نالییش هەر لەو سالانەدا چاپکرا. پێشتریش لە ١٩٢٢دا دیوانی مەحوی چاپکرا . دیوانی حاجی قادری کۆییش هەر لەو سەردەمانــەدا لەچاپدراوە ــ وەرگێڕ •

(١٣) ئەو پێشەکییانەی لە سەرەتای ئەم دیوانانەوە لە چاپدراون هیچیــان ئەوە نین بە لێکۆلینەوە دابنرێن ــ وەرگێڕ •

(١٤) مەبەست لە (عەبدوللا کەریم حەزازی) (مەلا عەبدولکەریمی هەکزی)یە • ــ وەرگێڕ •

(١٥) ڕاستەکەی : هەنــدێ لە شاعیرانی ... ئەگیــنا گەلــێ شاعــیریتری هاوچەرخی ئەو سەردەمەی نووسەر هەبووە باسی نەکردوون ــ وەرگێڕ•

(١٦) خاوەنی وتار (ی)ی پاش (ئەحمەد)ی بە بەشێك لە ناوی یەکەمی داناوە ــ وەرگێڕ •

سالی ١٩٤١دا چەند بەرهەمێکی کۆمەلایەتی‌و سیاسی‌و ئەدەبی لە بەغدا لەلایەن نووسەری بەناوبانگ ڕەفیق حیلمی‌یەوە لەژێر ناوونیشانی « ئەدەبی کوردی »دا دەرچوو (١٧) • نووسەر لەم کتێبەیدا بە گشتی لە بەرهەمی شاعیرانی هاوچەرخی کوردی کۆلیوەتەوە •

لە شاکاری ئەم شاعیرانەدا خەبات دژی دەرەبەگ‌و ئەوانەی میللەتیان ئەچەوساندەوە دەنگی داوەتەوە •

ڕەفیق حیلمی لەم‌کتێبەدا باسی ئەم شاعیرانەی خوارەوەی نووسیوە : حەمدوون ، بێخود ــ مەحموود ، موحەممەد خاکی ، خەستە ، عەبدولخالق ئەسیری ، حەمدیی ساحێبقران ، ئەحمەد موختار بەگی جاف ، فایق بێ‌کەس ، پیرەمێرد ، حەریق ، حاجی قادری کۆیی •

لە سالانی ١٩٤٠ ــ ١٩٤٤دا لەسەر لاپەڕەی گۆڤارە کوردی‌یەکان گەلێ وتار دەربارەی ئەدەب بلاوکراوەتەوە • بەتایبەتی لاپەڕەیەك لە شیعرو ئەدەبیاتی کوردی ــ ڕەفیق حیلمی ، دەربارەی شیعری شاعیری کورد سالم ــ گەلاوێژ ، ژمارە ١ ، ٢ ، ٣ سالی ١٩٤٤ ، مامۆستا ڕۆژبەیانی : کێشی شیعری کوردی ــ گەلاوێژ ژمارە ٢ ، سالی ١٩٤٤ ؛ جامی (١٨) : ئەدەبی کوردی ــ گەلاوێژ ، ژمارە ٦ ، سالی ١٩٤٤ ؛ گیو موکریانی ، شاعیری کلاسیکی

---

(١٧) ئەم کتێبە ناوی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی‌یە). بەرگی دووهەمیشی لە ١٩٥٦دا دەرچووە . تێناگەم مەبەستی خاوەن وتار لە (چەند بەرهەمیکی کۆمەلایەتی‌و سیاسی‌و ئەدەبی ) چی‌یە کە لەلایەن مامۆستا ڕەفیق حیلمی‌یەوە دەرچووە لەژێر ناوی (ئەدەبی کوردی)دا . ڕاستە مامۆستا ڕەفیق حیلمی کۆمەلێ بلاوکراوەی سیاسیی هەیە ، بەلام لەژێر ناوونیشانی (ئەدەبی کوردی)دا نی‌یە ــ وەرگێڕ .

(١٨) ڕاستەکەی (جیم) یا (ج)ە ، کە لام‌وایە مەبەست مامۆستا جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی بێ ــ وەرگێڕ .

کورد ، موحەمەد ڕەشید دزەیی ، دەنگی گیتی تازە ، ژمـارە ١ ، ١٩٤٥ ؛ شاعیری گەنجی کورد بێ‌کەس ــ نزار ژمارە ١٩ ، ١٩٤٨ •

هەروەها هەندێ وتاری‌تریش لەژێر هەمان ناوونیشانـدا « ئـەدەبی کوردو تێپەڕبوونی سەد ساڵ بەسەریا » بڵاوکرایەوە • لە ساڵانی ٥٠دا چەند بەرهەمێکی‌تری ئەدەبی کوردی بەشێوەیەکی فراوانترو لێکۆڵینـەوەیەکی گشتی‌یەوە چاپ‌کرا وەکو کتێبەکانی ئەم نووسەرانە : عەلائەدین سەججادی ، ڕەفیق حیلمی ، مارف خەزنەدار ، کەریم شارەزا ••• تاد لە ساڵی ١٩٥٢دا لە بـەغدا بەرهەمێکی گرنگی ئەدەب‌ناس‌و مێژوونووسی کورد عەلائەددین سەججادی بە زمانی کوردی دەرچوو لەژێر ناوی « مێژووی ئەدەبی کوردی لە کۆنەوە تا کۆتاییی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم » (١٩) •

نووسەر لە پێشەکیی کتێبەکەیدا ئـەوەی خستووەتـە بەرچـاو کـە دەوڵەمەندیی ئەدەبی کوردی‌و دەستوورو نەریتی کوردان بـە خوێنـەران بناسێنێ •

هەروەها ئەوەش نیشان ئەدات کە چۆن میللەتی کورد لەگەڵ کاروانی میللەتانی‌تردا شان‌بەشان ڕۆیشتووەو لە دروست‌کردنی کولتووری جیهان‌دا بەشداریی کردووە • نووسەر ئەوە پیشان‌ئەدات کە زەحمـەتی نووسـین‌و لێکۆڵینەوەیەکی وەك هینەکەی ئەو لە نەبوونی سەرچاوەی ئەدەب‌ناسی‌و هەموو جۆری ئەو دیالێکتانەدایە کە شاعیران‌و نووسـەران بەرهەمـەکانی خۆیانیان دەماودەم پێ نووسیوەتەوە •

بەلام لەگەڵ ئەم گیروگرفتانەشدا کە هاتوونەتە ڕێگای ، توانیویەتـی بەسەر ئەو کەم‌وکورتی‌یانەدا زاڵ‌بێ‌و ئەو ئەرك‌و فرمانەی خستبوونی‌یـە سەرشانی خۆی بە جوانی‌و ڕێك‌وپێکی‌و سەرکەوتوویی بەجێ‌یان بهێنێ •

---

(١٩) عەلائەددین سەججادی ، مێژووی ئەدەبی کوردی ، بەغدا ، ١٩٥٢ .

عەلائەددین سەججادی سەرچاوەیەکی زۆری لە نووسینی « مێژووی ئەدەبی کوردی »دا بەکارهێناوە چ بە زمانی عەرەبیو کوردیو فارسیو چ بە زمانەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا •

هەروەها چەند زانیاری‌یەکی‌تری لە هەندێ وتارو دیوانی شاعیرەکانیش وەرگرتوە لەگەڵ ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی کە لە عێراقو ئێرانو سووریاو تورکیا دەرچوون بەکاری‌هێناون •

ئەم باسە زانستی‌یانەی عەلائەددین سەججادی بە شێوەیەکی گشتی مەتریاڵێکی زۆریان لەبارەی شاعیرو نووسەرو زانا کوردەکان تیا کۆکراوەتەوە •

عەلائەددین سەججادی سەرەڕای هەموو ئەمە بوونی ئەدەبێکی دەوڵەمەندی کوردیشی سەلماندووە کە لەسەر بناغەی کولتووری نەتەوەیی بنیات‌نراوە• عەلائەددین سەججادی بیرو ڕای زانای فارس ڕەشید یاسمیی[20] بەدرۆ ئەخاتەوە کە نووسیویەتی «ئەدەبی کوردی لەڕاستیدا ئەدەبی کوردی نی‌یە ، بەڵکو ئەدەبێکە لە زمانی فارسی‌یەوە هەڵێنجراوە »[21] زیاد لەمە چەند تێبینی‌یەکی گرنگی تریش لەبارەی ژیانی کوردو ژمارەی کوردان لە ئێرانو عێراقو سووریاو تورکیاو یەکێتیی سۆڤیەتو چەند وڵاتێکی‌ترا ، لەناو ئەم کتێبەدا بەدی‌ئەکرێ •

نووسەر نەخشەیەکی ئاسایی بۆ دامەزراندنی باری کۆمەڵایەتی‌و دابەش‌بوونی چینایەتیی کوردان ئەکێشێ • نووسەر بەگوێرەی ئەو نەخشەیە کوردەکان ئەکا بە دوو بەشەوە : نیشتەجێو کۆچەر لەگەڵ سیستێمی هۆز •

---

(٢٠) ڕەشید یاسمی زانایەکی کوردە ، بەڵام بە فارسی نووسیویە ــ وەرگێڕ .

(٢١) رشید یاسمی : کرد و پیوستگی نژادیو تاریخی او ، تهران ١٩٥٢ ، ص ١٤٣ ــ ١٥٥ .

هۆزەکانیش لەناوخۆدا دابەش ئەبن بە دەرەبەگ ( خان ، بەگ ، ئاغا ، سەیید [٢٢] شێخ )و جووتیـــار •

بەڵام ڕاستەکەی ئەم شێوەیە لە دابەش بوونی ئێستای کۆمەڵەی کورددا بەدی ناکرێ • هەروەك نووسەر تێبینی ئەکات کۆچەرەکان بەرە بەرە ئەبنـە نیشتەجێ‌و ژمارەیان کەم‌ئەبێتەوە • دەرەبەگی کورد ئیتر ئەوە نین کە لـە ماوەی سەدەی ڕابوردوودا بوون ، ئەگەر ئەو سەردەمە هەموو کاروباری ناوخۆو ڕامیاری‌یان لە کوردستانی ئێران‌و تورکیاو عێراقدا لەژێر دەستـــا بووبێ ، ئێستا ئەوەیان بەدەستەوە نەماوە، بەڵکو هەموو کاروبارێکی ناوخۆو دەوڵەتی‌و ڕامیاری لەژێر دەستی دەوڵەتدایە •

لەگەڵ ئەمەدا لە سەردەمی ئێســـتای میللـــەتی کورددا وردە بۆرژراو بۆرژوای کۆمپرادۆری ( بازرگانی بەسراو بەسەرمایەی دەرەوە )و چینـــی کرێکارو توێژی ڕۆشنبیرانیش پێکهاتووە [٢٣] •

لە کارەکانی نووسەردا ئەوە بەدی‌ئـــەکرێ کـــە کـــورد میللەتێـــکی سەربەخۆیەو خاوەنی زمان‌و ئـــەدەب‌و مـــێژوو و زەوی‌و خووڕەوشـــت‌و کەلەپووری خۆیەتی •

عەلائەددین سەججادی ئەوەی دەست‌نیشان کردووە کەوا زوربـــەی شاعیران‌و نووسەرانی کورد بەرهەمیان تەنها بە زمانی کوردی نەنووسیوە ،

---

(٢٢) ڕاستەکەی وەنەبێ هەموو (سەیید)ێك لە چینی دەرەبەگ بێ . سەییـــد هەرچەند لە کوردستاندا لەبەر سەییدی‌یەکەی ڕێزی لێ ئەگیرێ ، بەڵام پایەیەکی چینایەتیی تایبەتیی نی‌یە . سەییـــدی دەرەبـــەگ‌و سەییـــدی جووتیاری هەژارو هەر چینێکی‌تری کۆمەڵیش هەیە ــ وەرگێڕ .

(٢٣) ئەم باسی لێکۆڵینەوەی چینایەتی‌یە هیی مامۆستا عەلائەددین نی‌یـــە ، هیی خاوەنی وتارە . بۆیە ئەبوو ئەوەی بووتایە کە مامۆستا عەلائەددیـــن کتێبەکەی لە ١٩٥٢دا داناوەو ئەم وتارەکەی لە ١٩٧٥دا بڵاوکردوەتەوە . هەروەها ئەبوو ئەم باسە کۆمەڵایەتی‌یەی لە پەراوێزدا بنووسیایە ، چونکە وتارەکەی ئەو بۆ مێژووی ئەدەبی کورد تەرخان‌کراوە ــ وەرگێڕ .

بەڵکو بە زمانی فارسیو عەرەبیو تورکیش نووسیویانەو لەپێشخستنی کولتووری عەرەبو تورکو فارسیشدا بەشداری‌یان کردووە •

نووسەر بەشێکی تایبەتیی کتێبەکەی بۆ مێژووی ئەدەبی کورد تەرخان کردووە کە ئەمەش ئەبێ بە دوو بەشەوە :

١ــ بەرهەمی سەرزاریی کوردان •

٢ــ ئەدەبی نووسراوی کوردی ، کە زۆرترین بەرهەمی هونەری ئەگرێتەوە • نووسەر بەکورتی خاسیەتی ژانرەکانی فۆلکلۆری کوردی دەرئەخا وەك حەکایەت ، لاواندنەوە ، پەندی پێشینیان ، داستانی پاڵەوانێتی، ئەفسانە ، گۆرانی ، دڵداریو قارەمانەتی ، گەڕەلاوژە [٢٤] • نووسەر بە گشتی گرنگیی بە داستانی پاڵەوانێتیو ڕۆمانتیکی داوەو پۆیەمی میللیی شی‌کردووەتەوە • بۆنموونە ( جوامێرو دایك ، شەریفو هەمەوەند ، ناسرو ماڵماڵ ، کوردو گۆران، شەماڵو زەلان ، خەزاڵو کاکەلاس ، قارەمانو قەیتەران ، دوانزە سوارەی مەریوان ، جیهانگیرو ڕۆستەم ، ئاسمانو زەوی ، حەوت پشتی ڕۆستەم ، بارامو گوڵنادر [٢٥] ، ڕۆستەم زەرد ڕەنگ [٢٦] ، مەنیژەو بێژەن ، فەرهادو شیرین ، شیرینو خوسرەو [٢٧] • عەلائەددین سەججادی نووسیویەتی : لەناو ئەمانەدا تەنها ( فەرهادو شیرین)و (شیرینو خوسرەو) هیی کورد نین ، وەرگێڕانێکن لە زمانی فارسی‌یەوە بۆ زمانی کوردی • خاوەنی ئەم دوانەش (نیزامی)یە ، بەڵام ئەوانی‌تر موڵکی کوردن •

---

(٢٤) ئەوەی ڕاستی بێ مامۆستای سەججادی لە کتێبەکەیدا تەنها باسی ئەم بەشانەی فۆلکلۆر ئەکات ( ئەفسانە ، داستان ، پەندو قسەی نەستەق ، چیرۆك ) ــ وەرگێڕ •

(٢٥) ڕاستەکەی (بارامو گوڵئەندام)ە ــ وەرگێڕ •

(٢٦) ڕاستەکەی (ڕۆستەمو زەردە هەنگ)ە ــ وەرگێڕ •

(٢٧) ڕاستەکەی (فەرهادو شیرین)و (شیرینو خوسرەو) هەر یەك داستانێو هەرسێ ناوەکە قارەمانە سەرەکی‌یەکانی داستانەکەن ــ وەرگێڕ •

هەندێ لەم پۆیەمانەی عەلائەددین سەججادی باسی کردوون ، نووسراونەتەوەو هەندێکی کەشیان کە بەشی زۆریانن لەناو میللەتدا ئەژینو لەسەر زاری خەڵکن ، واتە فۆلکلۆرنو خاوەنیان دیار نی یە •

لە ئەدەبی کوردیو فۆلکلۆردا نووسەر قسەی نەستەقی کوردیی بەشێوەیەکی فەلسەفی شی کردووەتەوە کە لە بیروباوەڕی میللەتەوە هەڵقولاوە [ تەماشای لاپەرە ۱۱۲ ــ ۱۱۹ی کتێبەکە بکە ] •

هەروا لەسەر ڕۆڵی ڕۆشنکاریی ئەدەبی کوردی ئەوەستێ [ تەماشای لاپەڕە ۱۲۲ ــ ۱۲۸ بکە ] •

عەلائەددین سەججادی لە چەند بابەتێکی گشتییتریش ئەکۆڵێتەوە وەکو : مێژووی ئەدەب ، دابەش کردنی ئەدەب بەسەر قۆناغەکانیدا ، ئەدەبی کۆنی ڕۆژهەلات • لە چاپی دووهەمی کتێبەکەیدا نووسەر هۆی دەرکەوتنی ئەدەب لە شێوەکانی کوردیدا دەستنیشان ئەکاتو ڕوونیئەکاتەوە : (گۆران) یاخود (هەورامان) ــ بەپێی ئەو زاراوەیەی کە نووسەر بەکاری ئەهێنێ ــ ، سۆرانی ، بۆتانی ــ واتە (کرمانجی) ــ ، موکری ، لوڕی [(۲۸)] •

عەلائەددین سەججادی هۆی سەرهەڵدانی ئەدەب لەسەر بناخەی دیالێکتە بنچینەیی یەکانی کوردی بە نەبوونی دەزگایەکی سەربەخۆو مەرجە جیۆگرافیایی یەکانی کوردستان لێك ئەداتەوە [تەماشای لاپەڕە ۱٤۱ ــ ۱٤٥ بکە ] •

نووسەر سەرگوزەشتەو بیۆگرافیای ۲٦ شاعیری مەزنو ناوداری کورد دەورئەکاتەوە کە لە سەدەی دەهەمو نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا

---

(۲۸) ڕاستەکەی هیچ جیاوازی یەکی ئەوتۆ لەنێوان چاپی یەکەمو دووهەمی مێژووی ئەدەبی کوردیدا نی یەو ، ئەم بابەتانەی خاوەنی وتار باسیان لێ ئەکا لە چاپی یەکەمیشدا هەن ــ وەرگێڕ .

ژیاونو ئەم شاعیرانەی خوارەوە بەشاعیری مەزنی لیریك [٢٩] ناوئەبا : مەلای جزیری ( ١٤٠٧ ــ ١٤٨١) ، نالی (١٧٨٧ ــ ١٨٥٥) [٣٠] ، کوردی ( ١٨٠٩ ــ ١٨٤٩ ) ، مەولەوی (١٨٠٦ ــ ١٨٨٢) ، جەبـــاری مەحـوی (١٨٣٠ ــ ١٩٠٤ ) [٣١] ، حەریق (١٨٥١ ــ ١٩٠٧) ، ئەدەب ( ١٨٥٩ ــ ١٩١٢ ) •

لە بەرهەمەکانی ئەم شاعیرانەشدا : ئەحمەدی خانی (١٦٥٠ ــ ١٧٠٦) ، شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٣٥ ــ ١٩٠٩) ، حـاجی قـادری کۆیی (١٨١٥ ــ ١٨٩٢) ، سالم (١٨٠٠ ــ ١٨٦٦) ، پیرەمێرد (١٨٦٧ ــ ١٩٣٠) [٣٢] حـەمدی ( ١٨٧٦ ــ ١٩٣٦) ، بێکەس (١٩٠٥ ــ ١٩٤٨) ــ ئاوازی نەتەوایەتی زاڵە •

لە کتێبەکەی سەججادیدا لیستەیـەك بۆ ئـەو شاعـیرو نووسـەرو مێژوونووس‌و فەیلەسووفە کوردانە کراوە کە بەرهەمیان بە زمانی کوردی نووسیوە [ تەماشای لاپەڕە ٥٣٥ ــ ٥٥٠ بکە ] • عەلائەددین سـەججادی ئەوەی دەست‌نیشـان کردووە کـە ئـەیەوێ لـە بەرهـەمی دووهـەمی مەنەگرافیاکەیدا بەدرێژی باسـی بەرهەمی ڕووە هـەرە دیارەکانی ئەدەبی هونەری ، ئەدەبی مێژوویی‌و فەلسەفەی ئەدەبی شی‌بکاتەوە •

بەشێکی تایبەتیی کتێبەکەی سەججادی تەرخانە بۆ دوان لەبارەی ئەو

---

(٢٩) هەرچەند ئەم شاعیرانە کەم یا زۆر شیعری لیریکی‌یـان هەیـە ، بـەڵام ناتوانین بە شاعیری مەزنی لیریکیان بژمێرین چونکە شاعیری لیریك ئـەبێ شاعیری کلاسیك بێ ــ وەرگێڕ •

(٣٠) لە کتێبەکەی سەججادیدا ساڵی هاتنە دنیای نالی بە ١٧٩٧ دانراوە ــ وەرگێڕ •

(٣١) (جەباری مەحوی) هەڵەیە • جەباری‌و مەحوی دوو شاعیری جیاوازن • مامۆستا عەلائەددین سەججادیش هەر بەجیای بـاس‌کردون • مـەلای جەباری لە دەشتی کەرکوك ژیاوەو سـاڵی ١٨٧٦ای ز کۆچی دوایـی کردووە • مەحوی‌یش لە سلێمانی ژیاوەو لە ١٩٠٦دا مردووە ــ وەرگێڕ •

(٣٢) حاجی قادری کۆیی لە ١٨٩٧و پیرەمێرد لە ١٩٥٠دا مردووە ــ وەرگێڕ•

ڕۆژنامەو گۆڤارانەوە کە ناوبەناو دەرئەچوون [ تەماشای لاپـەڕە ٥٥١ — ٥٥٨] بکە • نووسەر دەرکەوتنی ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەش ئەبەستێتەوە بـە دەرکەوتن‌و پێشکەوتنی جووڵانەوەی ڕزگاری خوازیی نەتەوەییی کوردەوە لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمدا •

نووسەر ناوی ٣٤ ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی ئەهێنێ کە مەتریاڵێـــکی زۆر دەربارەی مێژوو و ئەدەب‌و زمان‌و ئەتنۆگرافیاو جیۆگرافیاو ئابووریی کوردستان لە لاپەڕەکانیاندا بڵاوئەکرایەوە •

ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانە ڕۆڵێکی گرنگیان لە بووژاندنەوەی هەســتی نەتەوەییی کورددا بینی •

نووسەر لەم‌کارەیدا ئەوە دەرئەخات کە ئەدەبی کوردی پێوەندی بـە ئەدەبی گەلە کۆنەکانەوە هەیە : ئەدەبی میســری [ لاپەڕە ٥٥٩ — ٥٧٢ ] ، ئەدەبی فارسی [ لاپەڕە ٥٧٢ — ٥٨٠ ] ، ئەدەبی چینی [٥٨١ — ٥٨٣] ، ئەدەبی هیندی [ لاپەڕە ٥٨٣ — ٥٩٧ ] ، ئــەدەبی عیبری [ لاپەڕە ٥٩٧ — ٦٠٥ ] ، ئەدەبی گریکی یاخود یۆنانی [ لاپەڕە ٦٠٥ — ٦١٨ ] ، هــەروەها ئەدەبی ڕۆمانی [ لاپەڕە ٦١٨ — ٦٢٤ ] ، بەڵام ئەو بەڵگە زانستی‌یانە نادا بەدەستەوە کە قسەکانی ئیسپات ئەکەن • نووســەر بۆ ئــەو پێوەندی‌یــەی نێــوان ئەدەبی کوردو ئەدەبی ئەم میللەتە کۆنانە ئەم خاسیەتانە ئەکات بە بــەڵگە : لەیەکچوونی ئەدەب‌و ژانرەکانی فۆلکلۆری کوردی‌و ئەدەبی ئەم میللەتانە ، نزیکی لە یەک‌و خاسیەتی قارەمانانی ناو بەرهەمەکان ، لەگەڵ دروست‌بوونی دنیاو زۆرانبازیی هێزی چاکەو خراپە، هەروەها پارێزگاری کردنی دەستوورو نەریتی کوردان لەناو ئەو دەستوورو نەریتانەدا کە ئەمانەش ئەگەڕێنــەوە بۆ ئایینە کۆنەکانی میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست •

کتێبەکەی نووسەر لەژێر کارتێ‌کردنێکی گەورەی زانستی ئەورووپای

ڕۆژئاوادا نووسراوە • نووسەر کولتووری میللەتی کورد بە ئابووری‌و ژیانی کۆمەڵەوە نابەستی [٣٣] •

لە ساڵی ١٩٥٦دا کتێبی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی)ی [٣٤] ڕەفیق حیلمی بە شێوەیەکی گەورەترو چاکتر لە بەغدا چاپکرایەوە [٣٥] •

لەم کتێبەدا نووسەر بە دوورو درێژی لە بەرهەمی کۆمەڵێ لەشاعیرانی کوردی کۆڵیوەتەوە کە چۆن ئاوازی نیشتمانی لەو بەرهەمانەیان بەرز ئەبێتەوە ، بۆنموونە : دلدار (١٩١٧ ــ ١٩٤٨) ، ڕەمزیی مەلا مارف (١٩١٢ ــ ١٩٥٦) [٣٦] ، زێوەر (١٨٧٩ ــ ١٩٤٨) ، ئەوڕەحمان بەگی سالم (١٩٠٥ ــ ١٩٥٩) [٣٧] ، سەلام (١٨٩٢ ــ ١٩٥٩) ، عەلی کەمال باپیر (١٨٨٧ ــ ١٩٧٥)، گۆران (١٩٠٤ ــ ١٩٦٢) ، نووریی شێخ صالح (١٨٩٦ ــ ١٩٥٨) [٣٨] •

---

(٣٣) هەرچەند کتێبەکەی مامۆستا سەججادی گەورەترین کتێبە کە لەسەر مێژووی نەك تەنها ئەدەب ، بەڵکو تێکرای کولتووری کورد دانرابێ ، هێشتا تەرخان‌کردنی ئەمەندە جێگا بۆ لێ‌دوانی لە وتاری گۆڤارێکدا شتێکی ڕاست‌و بەجێ نی‌یە .
سەرەڕای ئەمە ئەبوو نووسەر وەك لایەنە باشەکانی کتێبەکەی لێکداوەتەوە بەوپەڕیە لە ناتەواوی‌یەکانیشی بدوایە چونکە ڕێ‌و شوێنی ڕەخنەیی وا پێویست ئەکات ــ وەرگێڕ .

(٣٤) ڕەفیق حیلمی ، شیعرو ئەدەبیاتی کوردی ، بەغدا ١٩٥٦ ، بەرگی دووهەم ــ وەرگێڕ .

(٣٥) ئەوەی لە ١٩٥٦دا چاپکرا ، چاپەکەی ١٩٤١ نی‌یە ، بەرگی دووهەمیەتی‌و مەتریاڵی‌تری تیایە . سەیر ئەوەیە خاوەنی وتار لەگەڵ ئەم هەڵەیەشیدا ڕاستی‌یەکەی زانیوەو زانیویە مەسەلەکە چۆنە [ بڕوانە پەراوێزی پێشوو] ــ وەرگێڕ .

(٣٦) ڕەمزی مەلا مارف لە ساڵی ١٩٧٦دا مردووە ــ وەرگێڕ .

(٣٧) سالم هاوچەرخی نالی بووەو لە سەدەی نۆزدەدا ژیاوەو مردووە . نووسەر خۆیشی پێشتر ئەم ڕاستی‌یەی دەرخست ــ وەرگێڕ .

(٣٨) پێویست بوو نووسەر گرنگی‌یەکی زیاتری بەم کتێبە بدایە ، چونکە مەرجەکانی لێکۆڵینەوەی زانستیی تیایەو ، لە ڕووی مێژووی دانانیشەوە بەشی یەکەمی لەپێش کتێبەکەی مامۆستا سەججادیدا بە دە ساڵ لەچاپدراوە ــ وەرگێڕ .

نووسینەکەی کەریم شارەزا (کۆیەو شاعیرانی)[39] کە لە ساڵی ١٩٦١دا دەرچوو تەرخانکراوە بۆ شاکارەکانی شاعیرانی یەکێك لە مەڵبەندەکانی بیری ڕوون لە کوردستانی عێراقدا کە (کۆیە)یە • نووسەر بایەخێکی زۆری بە مێژووی ڕۆشنبیریی کۆیەو بیۆگرافیای شاعیرانو نووسەرو زانا ناودارەکانی کۆیـــە داوە •

شارەزا لەم نووسراوەیدا بەکورتی سیمـــاو ڕوخســاری بەرهـــەمو بیۆگرافیای ئەو شاعیرانە پیشانئەدا کە نـــاویان لـــە مەنەگرافـــیاکەی[40] عەلائەددین سەججادیدا نی‌یە ، حاجی قادری کۆیەی لێ دەرکەی[41] •

کەریم شارەزا ئەوەی پیشانداوە کە هەنـدێ لە شـــاعیرانی کۆیـــە شیعرەکانیان تەنها بە زمانی کوردی نەنووسیوە ، بەڵکو بە زمانانی گەلانـــی دراوسێش نووسیویانە • هەندێکیان بە فارسی‌یان نووسیوە وەکو مەنـــفی (حوسەینی مەلا ڕەسووڵ ) ، (حوسەینی سەیید ئەحمەد ، شێخ موحیەدینی نیهانی ) • ئەم شاعیرانەی خوارەوەش بە عەرەبی‌و کوردی‌و فارسی بەرهەمیان نووسیوە : مەلا حافزی مەحزوون ، کاك موستەفای سافی •

کتێبەکەی مارف خەزنەداریش ( اغانی کوردستان ) کتێبێکە بە زمانی

---

(٣٩) کەریم شارەزا ، کۆیەو شاعیرانی ، بەغدا ١٩٦١ .

(٤٠) مەنەگرافیا : لێکۆڵینەوەی زانستی لە بابەتێك ــ وەرگێڕ .

(٤١) ڕاستەکەی مەسەلەکە بەمجۆرە نی‌یە . عەلائەددین سەججادی بـــاسی ئەو شاعیرانە ئەکا کە بە بۆچوونی خۆی ناودارترین شاعـــیری کوردن . کەریم شارەزایش باسی شاعیرانی تەنها شاری کۆیە ئـــەکا کە دیـــارە بە بەراورد لەگەڵ هەموو شاعیرانی کورد ئەبێ تەنها تاكو تەرایەکیان بکەونە ڕیزی ناودارترین شاعیری کوردەوە ، هەر بۆیەش ئەم دوو نووسەرە تەنها لە حاجی قادری کۆیی‌دا یەکیان گرتوەتەوە کە هەم یەکێکە لە شاعیرانی هەرە ناوداری کوردو هەم ناودارترین شاعیری کۆیەیشە ــ وەرگێڕ .

عەرەبی نووسراوەو تەرخانکراوە بۆ شاعیرە دیارەکانی کوردستـــان (٤٢) •
کورد بە گەلی عەرەب ئەناسێنێ • لە پێشەکیی ئەم کتێبەدا دوکتۆر عەبدولغەنیم
نەججار(٤٣) نووسیویە : «میللەتی کورد میللەتێکی گەورەیە ، گەلێ شاعیرو
نووسەرو زاناو ئیشکەری میریی پێشکەش بە جیهانی عــەرەب کردووە »
هەروەها لەپاڵ ئەو ڕاستیەدا عەبدولغەنیم نەججار ڕۆڵی کورد لە مێژووی
ڕۆشنبیریی میللەتانی ڕۆژهەلاتی نزیکدا دەستنیشان ئەکا •

لەو بەشەدا ناوی سەلاحەددینی ئەییووبی ئەهێنێ کە دەولەتێکی لــە
میسر دروستکردو بووە هۆی هەلاتنو کشانەوەی خاچیەکانو ڕزگارکردنی
میللەتانی ڕۆژهەلاتی نزیكو کولتووریان •

نووسەر زۆر بە بەرزی شاعیرو نووسەرە کوردەکان هەلئەسەنگێنێو
پەنجە بۆ پێویستیی چاپکردنو لێکۆلینەوەی بەرهەمەکانیان درێژ ئــەکاو
سوودی ناساندنی گەلی عەرەب بە ئەدەبی دەولەمەندی کورد دەرئەخــات •

نووسەر لە کتێبەکەیدا فۆرمی شیعری میللیی کورد ئەنووسێو بــۆ
ئەوانە بەیت ( چوارخشتەکی ) ، گۆرانی (گۆرانی ، حەیران ، ستران)یــان
ئەخاتە پاڵ لەگەڵ هۆنراوە کە بە کێشی عەرووز دانراوە • لە نووسینەکەدا

---

(٤٢) لە ڕاستیدا ئەم کتێبە بریتیە لە کورتە باسێکی ئەدەبی کوردو بەشەکانی لە (٥) لاپەڕەدا . ئەنجا زۆر بەکورتی لە ١١ شاعیری کۆنو نوێ دواوەو ١٤ پارچە شیعری ئەمانەو کەسانیتری کردووە بە عەرەبی لــەگەڵ (٥) لاپەڕەش باسو تێکستی گۆرانیی میللی .

کتێبەکە بریتیە لە ٦٤ لاپەڕە . بە ڕای من بایەخی لەوەدایە کە پاش چەند ساڵ بێئاگاییی خوێندەوارانی عەرەب لە نموونەی ئەدەبی کورد ، ئەم کتێبە گۆمە وەستاوەکەی شلەقاندو دەنگی ئەدەبی کوردی لە گوێی بەشێ لە خوێندەوارانی عەرەبدا زرنگاندەوە ــ وەرگێڕ .

(٤٣) ڕاستەکەی (عبدالحليم النجار)ە ــ وەرگێڕ .

کورتە بیۆگرافیاو ناوەڕۆکی شیعری دەیان [٤٤] شاعیر بە زمـانی عەرەبـی نووسراوە کە ئەوانیش لە مەنەگرافیاکەی عەلائەددین سەججادیدا لێیان کۆڵراوەتەوە •

مارف خەزنەدار ناوی ئەو شاعیرانە ئەهێنێ کە بەم شێوانەی خوارەوە نووسیویانە •

لە کرمانجیدا : ئەحمەدی خانیو میهرەبان خاتوون •

لە سۆرانیدا : پیرەمێرد ، دڵدار ، بێ‌کەس ، نالی ، بێخود ، گـۆران ، میرزا شەفیع ، بابەتاهیر [٤٥] ، وەلی دێوانە •

لێرەدا نووسەر لەسەر دوو هۆنراوەی کوردیو وەرگێڕانیان بۆ زمـانی عەرەبی ئەوەستێو ئەیانگێڕێتەوە بۆ شاعیرێکی نەناسراو •

بێجگە لەمەش دەیان چوارینی گۆڕیوە لە بێچووە شێوە جیاوازەکانی دیالێکتی خواروو [٤٦] • لە کۆتاییی کتێبەکەیدا وتارێکی کورتی زانـای بەناوبانگ ( تۆفیق وەهبی)ی تێ‌هەڵکێشاوە کە بۆ بیرەوەریی مێژوونووسی مەزن موحەممەد ئەمین زەکی تەرخان کردووە [٤٧] •

---

(٤٤) وەك پێشان وتمانو پاشانیش خاوەن وتار ناوی ئەو شاعیرانە ئەهێنێ کە لە کتێبەکەدا لەسەریان نووسراوە ، تەنها کورتە باسێکی ١١ شـاعیر کراوە ــ وەرگێڕ .

(٤٥) میرزا شەفیع بە شێوەی (گۆرانی)و بابە تاهیر بە شێوەی لوڕی شیعریان وتووە ــ وەرگێڕ .

(٤٦) ژمارەی ئەو چوارینانەی بابا تاهیر کە مارف خەزنەدار کردوونی بە عەرەبی (٦) چوارینە ــ وەرگێڕ .

(٤٧) لەئاست ئەم هەڵسەنگاندنە پڕ قەدرو بایەخەی کتێبی ٦٤ لاپەڕەییی (اغانی کردستان)دا ئەبێ بزانین مامۆستا (کوردۆیێف) زمانی عەرەبی نـازانێو نووسەری کتێبەکەش خوێندنی بەرزی لەسەر دەستی ئەودا تـەواو کردووەو دیارە خۆی ناوەڕۆکی کتێبەکەیی بۆ شی‌کردووەتەوەو پـێ‌ی ناسانـدووە ، بۆیـە لەوانەیـە هـەر ئەویـش بەرپرسی گەلـێ لـەم بەهەڵەچوونانەی مامۆستا کوردۆیێف بێ ــ وەرگێڕ .

دانەرەکانی ئەو لێکۆڵینەوانەی تائێستا باسیان‌کرا بە شـێوەیەکی سەرەکی ناوی شـاعیرەکان ئەژمێرن‌و بەکورتی ناوەڕۆکی بەرهەمەکانیان ئەخەنە ڕوو و چەند نموونەیەکیان لێ وەرئەگرن • تەقەلای ئەوەیان نەداوە ڕێچکەو ڕێبازە ئەدەبی‌یەکان جیابکەنەوەو مەسـەلەی مێژووی ئـەدەبیش نابەسـتنەوە بە مێژووی بەرەوپێش‌چوونی کۆمەڵـگای کوردو مێژووی بزووتنەوەی ڕزگاری‌خوازیی نەتەوەی کوردەوە • ئەمە بەتایبەتی ئەگەڕێتەوە بۆ لێکۆڵینەوەکانی مارف خەزنەدارو کەریم شـارەزا • لەگەڵ ئەمەشـدا نووسینەکانی ئەو نووسەرانە باری سەرنجێك دەربارەی مێژووی پەیدابوون‌و بەرەوپێش‌چوونی ئەدەبی کوردی پێك‌دەهێنن •

لەگەڵ ناوهێنانی ئەو کارانەی سەرەوە ، لە سالآنی ٥٠دا چەندەها وتارو لێکۆڵینەوە چاپ‌کراوە •

ئەم وتارو لێکۆڵینەوانە بەرهەمی چەند شـاعیرێکیان شی‌کردووەتەوە لەگەڵ جۆرەها مەسەلەی ئەدەبیات‌ناسی •

بۆنموونە لە ژمارە ٢ی ساڵی ١٩٥٨ی گۆڤاری ( هیوا )دا وتارێـکی موحەممەدی مەلا کەریم بلاوکراوەتەوە بە ناوونیشانی « مەسەلەی ئەدەبی کوردی »[٤٨] • لە ژمارە (٥)و (٦)ی گۆڤاری (شەفەق)ی ساڵی ١٩٥٨یشـدا وتارێـکی ڕەفیق حیلمی بـە ناوونیشـانی « نەتەوەی کوردو شـیعر » بلاوکرایەوە •

ڕەفیق حیلمی نووسیوویە : ئەگەر لە کاتی ڕابووردودا شاعیرانی کورد ئاوڕیان لە بابەتی خۆشەویستی ، سروشت‌و ئایین داوەتەوە ، لە کاتی ئێستادا

---

(٤٨) لە چاوگێڕاندا بە وتارە ئەسڵی‌یەکەدا ئـەم وتەیەم بەرچاو نەکەوت کە مامۆستا کوردۆێڤ نووسیویـەتی • وتـارەکەش بەم نـاوونیشـانەیە : « ئەرکەکانی سەرشانی ئەدەبێ ئەمڕۆمان » ــ وەرگێڕ •

شاعیران ئەوە نین ، بەڵکو هیوای میللەت‌و ژیان‌و جێگایەکی تایبەتی‌یان هەیە •

عوسمان سابیر لە وتارێکی‌دا بە ناوونیشانی « شاکاری شاعیرانی کورد »[٤٩] کە لە ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٦١ی گۆڤاری (شەفەق)دا بڵاوی کردووەتەوە ڕەخنە لە هەڵبژاردەی بەرهەمی شاعیرەکان ئەگرێ لەگەڵ دانانی مەسەلەی ئەدەبی ئێستای کورد • لە وتارێکی‌تریشدا بە ناوی « ئەدەب‌و ڕۆڵی ئەدەب » کە لە ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩٦١ی گۆڤاری (شەفەق)دا بڵاوکراوەتەوە ، دەربارەی ئەدەب‌و واتای ئەدەب لە بووژاندنەوەی بیری میللەت‌و لە پلەی ڕۆشنبیرانی کورد ئەدوێ[٥٠] •

ناوهێنانی ئەو وتارانە بۆ ڕوون‌کردنەوەی ئەوەیە کە بەشێك لە بەرهەمی شاعیران تەرخان‌کراوە بۆ لێکۆڵینەوەو بەشێکی‌تری بۆ مەسەلەی ئەدەبیات ناسی • بەڵام هێنانەوەی چەند بەڵگەیەك ئەوە دەرئەخات کەوا گۆڕان لە لێکۆڵینەوەی مێژووی ئەدەبی کورددا ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ٦٠ • هەر لەم‌کاتەوە دەست بە چەند هەنگاوێکی زانستی‌یانە کرا لە لێکۆڵینەوەدا • دوابەدوای دەرچوونی وتارە زانستی‌یەکان‌و لێکۆڵینەوە مەنەگرافی‌یەکان لە مێژووی ئەدەبی کورددا ، لێکۆڵینەوەو تێبینیی‌تریش دەربارەی بەرهەمی شاعیران‌و کارەکانیان دەرکەوت • ئەوەش بووە هۆی فراوان‌کردنی واتای ئەدەب‌و فۆلکلۆر لە لێکۆڵینەوەی کولتووری میللەتی کورددا •

یەکێك لەم کارانە کتێبەکەی ئەدیبی ناسراو موحەممەدی مەلا کەریم بوو دەربارەی حاجی قادری کۆیی بە ناوی « حاجی قادری کۆیی شاعیری

---

(٤٩) نووسەری وتار « عوسمان مستەفا »یە نەك «عوسمان سابیر»و ناوونیشانی وتارەکەش بەم‌جۆرەیە : هۆنراوەی کوردی ــ وەرگێڕ •

(٥٠) نووسەری وتار چونکە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکانی لە بەردەستدا نەبووە نەیتوانیوە بە گەلێ وتاری‌وا بزانێ کە زۆر لەمانە بایەخدارترن کە کردوونی بە بەڵگەو کەرەستە بۆ وتارەکەی ــ وەرگێڕ •

قۆناغێـــکی نوێیە لـــە ژیانی نەتەوەی کورد»[٥١] لـــەگەڵ کتێبەکەی تری « گەنجینەی فۆلـکلۆری کوردی»[٥٢] • لە کتێبی یەکەمدا لەســـەر ژیانو بەسەرهاتی شاعیر نووسراوە •

لەناو ئەم بەرهەمەدا بیری پێشکەوتن‌خوازو هەستی نیشتمانپەروەریی حاجی قادر دیاری‌ئەدات لەگەڵ خەباتی دژی دەرەبەگ‌و سوڵتانی تورکیاو شای ئێران • لە کتێبی دووهەمیشیدا گۆرانیی پاڵەوانێتی‌و لیریکی کوردە یەزیدی‌یەکانی کۆکردوەتەوە •

ڕۆڵی فۆلکلۆر لە دەنگدانەوەی مێژووی ڕاستەقینەی گەلی کورددا لە کتێبەکەی موحەمـــەد ئەمین عوسمـــاندا ئەبینرێ کە نـــاوی «گـــۆرانی‌و ژیان»ە[٥٣]• واتای هونەریی ئەدەبی لە جوانی پەروەریـــدا لە «فەرهەنـــگی وێژەی شاعیران»ی [٥٤] ئەحمەد ڕەشوانیـــدا بەدی‌ئـــەکرێ• نـــاوەڕۆکی فەرهەنگەکە لەم بابەتانەی خوارەوە پێك‌دێت : ــ خواســـتن ، نوکـــات ، هەڵبژاردەی شیعری شاعیرانی کورد (خۆشی‌یان ، هیوایان ، ڕووناکی‌یان) ، بەهار ، خۆشەویستی ، جوانیی ئافرەت ، ئاوارەیی دڵدار •

لە ساڵی ١٩٧٠دا موحەمەد ڕەسوڵ هاوار لە بەغدا شاکارەکانی شاعیری ناوداری کورد ( پیرەمێردی نەمر )ی[٥٥] بڵاوکردەوە •

---

(٥١) موحەممەدی مەلا کەریم ، حاجی قادری کۆیی شاعیری قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی نەتەوەی کورد ، بەغدا ، ١٩٦٠ •

(٥٢) موحەممەدی مەلا کەریم ، گەنجینەی فۆلکلۆری کوردی ، کۆمەڵێك لاوك‌و حەیران ، بەغدا ، ١٩٦٨ •

(٥٣) موحەمەد ئەمین عوسمان ، گۆرانی‌و ژیان ، بەغدا ١٩٦٨ •

(٥٤) ئەحمەد ڕەشوانی ، فەرهـــەنگی وێـــژەی شـــاعیران ، بـــەغدا ، ١٩٥٧ [ لەڕاستیدا ناوی کتێبەکە بەم‌جۆرەیە «فەرهەنگی هەڵبەست»و لە ساڵی ١٩٦٨دا لە چاپدراوە ] ــ وەرگێڕ •

(٥٥) موحەممەد ڕەسووڵ هاوار ، پیرەمێردی نەمر ، بەغدا ١٩٧٠ •

هاوار شیعرەکانی شاعیری لەڕووی بیری هونەری‌یەوە شی‌کردووەتەوە •

لە مەنەگرافیای (هەڵبەستی پیرەمێرد)دا عەبدوڵڵا بیمار[٥٦] شیعری نیشتمان پەروەری‌و پێشکەوتن‌خوازیی زاناو شاعیرو هونەرمەندی کورد پیرەمێرد دەست‌نیشان ئەکا • بیمار تێبینیی پێوەندی شیعرەکانی پیرەمێرد لەگەڵ فۆلکلۆری میللی‌و وەستایی‌و زیرەکیی شاعیر لە بەکارهێنانی ئەفسانەو چیرۆك‌و پەندو قسەی نەستەقی کوردیدا ئەکات •

نووسەر[٥٧] بۆ شیعرەکانی[٥٨] کێشی سیلابی بەکارهێناوە کە لە کێشی سیلابی میللی‌یەوە نزیکە •

کۆنگرەی نووسەرانی کورد لە بەغدا ساڵی ١٩٧٠و لە هەولێر ساڵی ١٩٧١ دەورێکی گرنگیان لە پێش‌خستنی ئەدەبیات ناسیدا بینی •

لە کۆنگرەکەدا بڕیاری پێویستیی دروست‌بوونی کۆمەڵێ ڕێکخراوی گشتی درا بەپێی هەڵبژاردن بۆ پاراستن‌و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیاتی کۆنی نەتەوەی کورد • لەگەڵ ئەمانەدا وتاری گرنگ‌و شی‌کراوی شیعری بەشێك لە شاعیرەکان دەرکەوت :

سادق بەهادین ، شاعیرە کوردەکانی ناوچەی ئامێدی ، نووسەری کورد، ژمارە (٢) ، ساڵی ١٩٧٠ ؛ عەزیز گەردی ، لاپەڕەیەکی شاراوەی مێژووی ئەدەبی نەتەوەکەمان ، مەلا خدری دەشتی ، برایەتی ، ژمارە ٨ ، ١٩٧٠ ؛ شێخ محەمەدی خاڵ، شێخ ڕەزای تاڵەبانی ، دەفتەری کوردەواری ، ژمارە ١ ــ ٣ ،

---

(٥٦) عەبدوڵڵا بیمار ، هەڵبەستی پیرەمێرد ، بەغدا ، ١٩٦٢ . [ ڕاستەکەی ( عەبدوڕڕەززاق بیمار )ە ــ وەرگێڕ ] .

(٥٧) دیارە مەبەست لێرەدا لە پیرەمێرد خۆیەتی، چونکە ئەوە خاوەنی شیعرەکانە نەك نووسەری وتار عەبدوڕڕەززاق بیمار ــ وەرگێڕ .

(٥٨) ئەبوو خاوەنی وتار بینووسی‌یایە «بۆ هەندێ لە شیعرەکانی» چونکە پیرەمێرد شیعری‌تریشی زۆرە لەسەر کێشی‌تر ــ وەرگێڕ .

بەغدا ١٩٧٠ ، کاکەی فەلاح ، هەندێ لە شیعرەکانی مەحوی[٥٩] ، برایەتی ، ژمارە ٧ ــ ٩ ، ١٩٧٠ ؛ مەحموود یوسف ، ئەدەبی کوردی ، برایەتی ژمارە ٨ ، ١٩٧٠ ••• تاد •

زۆرترین بابەتی لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی لە عێراقدا دوای شۆڕشی ١٩٥٨ دەستی پێ کرا •

بەڵام بەشێوەیەکی تایبەتی لەپاش دەرچوونی بەیاننامەی مارتی ١٩٧٠و دان‌نان بە مافی کوردو ئۆتۆنۆمیی ناوخۆی کوردستاندا ، وەچەی نوێی ئەدەبیات‌ناسیی کورد سەری‌هەڵدا •

لە ساڵانی ٦٠ ــ ٧٠دا ئەدیبو زمانەوانانی لاو دەستیان بە چاپکردنی دەستنووسی شاعیرە کوردەکان کرد • ژمارەیەکی زۆر لە دیوانی شاعیرە کوردەکانی سەدەکانی ناوەڕاست[٦٠] دەرچوو • مەڵبەندی چاپکردنی بەرهەمەکانیش ئەم جێگایانە بوون : بەغدا ، هەولێر ، سلەیمانی ، کەرکوك•

لە ساڵی ١٩٥٨ەوە تا ساڵی ١٩٧٠ هەر لە بەغدا ٩ دیوانی شاعیران دەرچوو ، لە هەولێر ٧ ، لە سلێمانی ٣ ، لە کەرکووکیش ــ ١ ــ دیوان چاپکرا[٦١] • لە گۆڤارەکانیشدا گەلێ وتاری ڕەخنەیی بڵاوکرایەوە کە تۆژینەوەیان لە شیعری شاعیرەکانو چارەسەرکردنی مەسەلەی زانستی ئەدەبیات ئەکرد •

بۆنموونە : کاکە مەم ، بیرەوەریی شێخ سەلامی نەمر ، هیوا ، ژمارە

---

(٥٩) وتارەکە بەم ناوو نیشانەیە « چەند سەرنجێك دەربارەی شیعرەکانی مەحوی » ــ وەرگێڕ •

(٦٠) مەبەست لە [ نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ]ە •

(٦١) ئەم ژمارەیە زۆر ناتەواوە . لە ساڵی ١٩٥٨ەوە تا ١٩٧٠ هەر لە بەغدا ٢٦ دیوان چاپکراوە . لە سلێمانی‌یش ٣٢ دیوانو لە هەولێر ١٥ دیوانو لە کەرکووك ٧ دیوان ــ وەرگێڕ .

٢٣ ، سالی ١٩٦١ ؛ عەبدولڕەززاق محەمەد ، لەگەڵ شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە دیوانەکەیدا ، هیوا ، ژمارە ٣١ ، ساڵی ١٩٦١ ؛ عەبدولخالق عەلائەددین ، لە گۆشەی ئەدەب ، هیوا ، ژمارە ٣٢ ، ، سالی ١٩٦١ •

لە وتاری یەکەمدا زیاتر شیعری نیشتمانپەروەری‌و خۆشەویستی ئەبینرێ• هەروەها لەلایەن شاعیری کوردی ناوەڕاستی ئەم سەدەیە سەلامەوە چەند شیعرێك بۆ ڕەخنەگرتن لە ئایین نووسراوە •

لە دوو وتاری‌تردا دانانی ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتی بۆ مەسەلەی لێکۆڵینەوەی زمان‌و ئەدەبی کوردی‌و هەوڵدان بۆ یەکگرتنی زمانی ئەدەبیی کورد دراوە • لە وتارێکی موحەممەدی مەلا کەریمدا کە لە ژمارە ٩ ـــ ١٠ی ساڵی١٩٥٩ی گۆڤاری هیوادا بە ناوونیشانی (شاکاری شیعری ئەدەبیات)[٦٢] بڵاوکراوەتەوە لەبارەی واتای بەرهەمەکانی شاعیرە کلاسیکی‌یە کوردەکان‌و ئەنجامی لێکۆڵینەوەی ئەو بەرهەمانەوە قسەکراوە •

هەوڵدان بۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی ئەم زانایانە گرتیانە ئەستۆ : مارف خەزنەدار ، عیززەددین مستەفا ڕەسووڵ ، ئیحسان فوئاد •

ئەمانە باوەڕنامەیان لە دانشگای ڕۆژهەڵاتناسی لە یەکێتیی سۆفیەت وەرگرتوە •

مارف خەزنەدار لە کتێبی « کێش‌و قافیە لە شیعری کوردیدا »[٦٣] لە هۆنراوەی میللی‌و کارتێکردن‌و ڕەنگدانەوەی هۆنراوەی کوردیی تازەو ئێستا ئەکۆڵێتەوە •

---

(٦٢) وتارەکە بەم ناوونیشانەیە : (ئەدیب‌و هونەرمەندەکانمان‌و پێویستی‌یەکانی ئەمڕۆی سەرشانیان)و لەم بابەتە نادوێ کە نووسەری وتار باسی ئەکات ـــ وەرگێڕ •

(٦٣) مارف خەزنەدار ، کێش‌و قافیە لە شیعری کوردیدا ، بەغدا ١٩٦٢ .

نووسەر ئەوە نیشان ئەدا کە لە هۆنراوەی کوردیدا پەیڕەوێکی تایبەتیی هەیە لە کێشی شیعردا ، بناغەی ئەمەش ( سیلاب )ە کە شیعری پێ هەڵئەبەسترێ • لەکۆتاییدا نووسەر ئەنووسێ : کێشی شیعری تازەی کوردی بەپێی ژمارەی سیلاب ( لە حەوتەوە تا سیازدەو زیاتر ) ئەکێشرێ •

ئەو دەستووری شیعر دانانە پەیتا پەیتا زاڵ ئەبێو ، ئەوەش لەدایك بوونی دەستووری میللی یە لە دانانی شیعردا •

لە کتێبێکی تردا بە ناوی « تێڕوانینێك لە مێژووی ئەدەبی نوێی کوردی »(٦٤) مارف خەزنەدار مێژووی ئەم ئەدەبە لە ساڵی ١٨٩٠ەوە تا ساڵی ١٩٦٠ ڕوون ئەکاتەوە •

نووسەر دیراسەی بەرەو پێشەوەچوونی شیعر دەکا هەر لە ڕەوانبێژی یەوە تا ئەگاتە گیروگرفتی دژوارتری ژیانی میللەت • نووسەر لە کارەکەیدا ڕۆڵی قۆناغی چاپ کردن لە پێشکەوتنی ئەدەبی تازەداو کارتێ کردنی سیاسەتی کۆمەڵایەتی و بەرەوپێش چوونی بابەت و ڕێچکەی ئەدەبیی پیشان داوە •

نووسەر ئەدەبی تەقلیدی دائەبڕێ و یەك لەدوای یەك تێبینی لە بەرهەمی شاعیرانی نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەم پیشان ئەدات •

نووسەر هەر بۆ ئەم قۆناغە چەند شاعیرێکی مەزنی ناوداری نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدە بەنموونە دێنێتەوە وەکو شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٤٢ ــ ١٩١٠) ، حەریق (١٨٦٥ ــ ١٩٠٩) ، ئەدەب (١٨٥٩ ــ ١٩١٦) •

مارف خەزنەدار خاسیەتی ئەو سەردەمە لە ساڵی ١٩١٨ەوە تا ساڵی ١٩٤٥ دەست پێ ئەکات وەکو قۆناغێکی تازە لە پێشکەوتنی ئەدەبی کوردیدا •

---

(٦٤) مارف خەزنەدار ـ تێڕوانینێك لە مێژووی ئەدەبی نوێی کورد ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ ( بە ڕووسی ) •

نووسەر لەناو ئەو شاعیرانەدا کە گرنگی‌یان بە مەسەلـەی نەتەوەیی‌و کۆمەلاّیەتی داوە ئەم شـاعیرانە هەڵئەسەنگێنێ : ئـەحمەد موختار جـاف ١٨٩٧ ــ ١٩٣٥ ، حەمدی ١٨٧٨ ــ ١٩٣٦ ، عەبدولواحید نووری ١٩٠٩ ــ ١٩٤٤ [٦٥] ، زێـوەر ١٨٧٥ ــ ١٩٤٨ ؛ بێ‌کەس ١٩٠٥ ــ ١٩٤٨ ، دڵـدار ١٩١٨ ــ ١٩٤٨ •

دوای جەنگی دووهەمی جیهان لە ئەدەبی کوردیدا ڕێچکەی ڕیالیستی دروست‌بوو • لەڕاسـتیدا بابەتی بەرهەمەکان بزووتنەوەی ئـازادیخوازیی نەتەوەیی‌و خەباتی چینایەتی بوو •

ئاوازێکی تازە لە شیعردا دروست‌بوو• ئەمە لە گۆڕانی پەیڕەوی کێشی عەرووزی بە کێشی سیلاب هاتە کایەوە • مارف خەزنەدار ئەوە دەست نیشان ئەکات کە ئەو شاعیرانەی ئەم ڕێچکەیان گرتووە ئەمانەن :

پیرەمێرد ؛ سەلام ، گۆران ، دڵزار ، جگەرخوێن ، هەژار ، موحەڕڕەم موحەممەد ئەمین[٦٦] ، مارف بەرزنجی[٦٧] •

لەم سالاّنەی دواییدا دەست‌کرا بە لێکۆڵینەوەی مەسەلـەی گشتیی زانیـاریی ئەدەب لەسـەر بنچینـەی شی‌کردنەوەی بەرهـەمی شـاعیرە کلاسیکی‌یەکان‌و شاعیرە تازەکان •

بۆ ئەم لێکۆڵینەوانە کارەکەی د• عیززەددین مستەفا ڕەسووڵ ئەکەین بە بەڵگە کە بە ناونیشانی « ڕیالیزم لـە ئەدەبی کوردیدا لەپاش جەنـگی دووهەمی جیهان »[٦٨] نووسیویەتی •

---

(٦٥) عەبدولواحید نووری شاعیر نەبووە ــ وەرگێڕ •

(٦٦) موحەڕڕەم موحەممەد ئەمین چیرۆك‌نووسە نەك شاعیر ــ وەرگێڕ •

(٦٧) مارف بەرزنجیش تاك‌و تەرایەك شیعری هەیە ــ وەرگێڕ •

(٦٨) الدكتور عزالدين مصطفى رسول ، الواقعية في الادب الكردي ، صـيدا ١٩٦٦ (بە عەرەبی) ــ وەرگێڕ •

نووسەر کەرەســەی ڕیالیزمی لە فۆلکلۆرو شیعــری کلاســیکدا ئەدۆزێتەوە • نرخی بابەتەکانی باوەڕنامەکە لەوەدایە کە پێشکەوتنی ئەدەبی کوردی لەگەڵ بــاری چەوساندنەوەی کۆمەڵایەتیو نەتەوایەتی ئەکۆڵێتەوە بەتایبەتی لــە کاتی جەنگی جیهانیدا کە بزووتنەوەی ئازادیخوازی نــەتەوە چەوساوەکانی ڕۆژهەڵات دەستیپێ‌کرد •

عیززەددین موستەفا ڕەســوول بناغەی خاسیەتی ڕیالیزم لــە ئەدەبی کوردیدا نیشان‌ئەدا وەکو نیشتمان پەروەریو خەبات لەپێناوی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو ڕزگارکردنی میللەتدا ، لەپێناوی ئاشتیو دۆستایەتیی میللەتاندا، لەپێناوی بەختیاریو سەربەستیو یەکســانیی هەموو میللەتە چەوساوەکانی جیهاندا •

نووسەر لە باسەکەیدا ئەگاتە ئەو ئەنجامە کەوا ئەدەبی تازەی کوردی چووەتە ڕیزی پێشەوە لە پێشکەوتنی ئەدەبی جیهاندا • ئــەدەب ڕۆڵێکی گەورە ئــەبینێ لەڕووی هونەریو ئیســتاتیك ( جوانناســی )و بــیری پەروەردەکردنی میللەتو لە خەباتیدا لەپێناوی دوارۆژێکی بەختیاردا •

ئیحسان فوئاد لە کارە گرنگەکەیدا « حاجی قادری کۆییو جێگای لە ئەدەبی کوردیدا »[٦٩] هەروەکو لێکۆلەرەوەکانی پێشــوو ، حاجی قادری کۆییی بە دامەزرێنەری بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی دائەنێ لە ئەدەبی کوردیدا • لە شیعرەکانی شاعیردا جێگاو پایەی شــاعیر لە بۆپێشەوەبردنی ئەدەبێکی تازەی پێشکەوتن خوازدا دەست‌نیشان ئەکات •

ئیحسان فوئاد مێژووی لێکۆلینەوەی شــیعرەکانی حاجی قادر ئەخاتە ڕوو • بۆ بەڵگەی کارەکەی ئەم ناوانە ئەهێنێتەوە : مێژوونووس موحەممەد

---

(٦٩) ئیحسان فوئاد ، شیعری حاجی قادری کۆییو جێگای لە ئەدەبی کوردیدا ــ کورتەی باوەڕنامە ــ ، مۆسکۆ ١٩٦٦ •

ئەمین زەکی ، ئەدەب‌ناسان عەلائەددین سەججادی ، ڕەفیق حیلمی ، گیوی موکریانی • ئەمانە لە ژیان‌و شیعرەکانی حاجی قادر کۆڵیونەتەوە • هەروەها لە کارەکەی موحەممەدی مەلا کەریم ئەدوێ کە تەرخان‌کراوە بــۆ شوێن‌و جێگای حاجی قادری کۆیی •

پاشان کورتە مێژوویەکی ڕاپەڕینەکانی کورد پیشان‌ئەدات لەوکاتەوە کە کوردستان لەنێوان تورکیای عوسمانی‌و دەوڵەتی ئێراندا دابەش‌کرا (ساڵی ١٥١٤)و کۆتایی هاتنی تا نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم •

نووسەر کورتە خاسیەتێکی شیعرەکانی شــاعیرو ژیانی پیشان‌ئەدات لەگەڵ باسی دامەزرێنەرانی ئەو قوتابخانە ئەدەبی‌یەی کە بە دیالێکتی خواروو (سۆرانی) دروست‌بوو ، وەکو نالی (١٧٨٧ ــ ١٨٥٥) ؛ ســالم ( ١٨٠٠ ــ ١٨٦٦) کوردی ( ١٨٧٩ ــ ١٨٤٩ ) ؛ ئەمانە شاعیرانی میرنشینیی بابان بوون لە ناوچەی سلێمانی • لە قوتابخانەی نالیدا ئەوە ئەبینرێ کە شاعیری کورد ئەحمەدی خانی « سەدەی حەڤدەهەم »و غەزەلەکانی کاریان لە قوتابخانەی نالی کردووە • هەروەها بیری سیاسیی پیاوانی وەك عەبدوڕڕەززاق بەدرخان‌و هەندێکی‌کە دەورێکی گرنگی لە پێشخستنی هەستی نیشتمان پەروەری‌دا گێڕاوە •

ئیحســان فوئــاد بایەخی شــیعرەکانی حاجی قادری کۆیی لــەوەدا دیاری‌ئەکات کە پڕن لە بیری نوێ بۆ یەکگرتنی میللەت‌و ڕزگار کردنی لــە ستەمی سوڵتانی عوسمانی • ئەوەتە شــاعیر بانگەوازی خەڵك ئەکات بــۆ گۆڕینی هەندێ پێڕەوی فێرکردنی منالآن بەشێوەیەکی تازەتر • هەروەها بۆ کردنەوەی قوتابخانەو بلاوکردنــەوەی چاپەمەنی‌و وەرگرتنی لــە میللەتانی ئەورووپا • بێجگە لەمانە شاعیر نرخی زمانی کوردی‌و فێربوونی لە پلەیەکی بەرزدا هەڵسەنگاندووە • ئیحسان فوئاد گەیشتووەتە ئەو ئەنجامە کە شیعری

حاجی قادری کۆیی هەنگاوێکە بۆ بەرەوپێش‌چوونی شێوازی شیعرو دانانی شیعرو دەستووری گۆڕانی عەرووز بۆ دەستووری سیلاب •

حاجی قادری کۆیی بانگی کردووە بۆ گۆڕینی ژیانی سیاسی‌و ئایینیی گەلی کوردو بۆ خەبات لەپێناوی دان‌نان بە مافی کورددا •

ئەم ئامانجانە شیعرەکانی حاجی‌یان لە شیعری ڕۆشن‌بیرەکانی سەردەمی (تەنزیمات) لە تورکیا نزیك‌خستووەتەوە •

چاوخشاندنێك بەوکارانەدا کە تەرخان کراون بۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی بەڵگەی ئەوەمان ئەداتێ کە میللـەتی کورد ئەدەبێکی دەوڵەمەندی میلليی هەیە کەتا ئەم دوایی‌یەش لەلایەن خوێندەوارە ئەورووپایی‌یەکان‌و زانا ڕۆژهەڵاتی‌یەکانەوە نەزانرابوو •

یەکەم هەوڵدان بۆ لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی لە عێراقدا لەلایەن زاناو ئەدیب‌و ڕۆشنبیرە کوردەکانەوە بوو •

گەورەترین ڕۆڵ لەم ماوەیەدا چاپەمەنی بینی ( نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەو نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ) •

لە لێکۆڵینەوەی شوێنەوارە ئەدەبی‌یەکاندا ئەم ڕێچکە ئەدەبی‌یانــەی خوارەوە دەست‌نیشان ئەکەین :

١ـ لێکۆڵینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی•
٢ـ شی‌کردنەوەی بابەتی بەرهەمی شیعر •
٣ـ لێکۆڵینەوەی بەشێك لە شاکاری شاعیرەکان •
٤ـ لێکۆڵینەوەی ژیانی شاعیرانی کورد لە شارەکانی عێراقدا •
٥ـ چاپ‌کردن‌و بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوەی ئەدەب‌و وەرگێڕانــی بەرهەمی شاعیرو نووسەرانی کورد بۆ سەر زمانی عەرەب •

کوردناسانی سۆڤیەت هەموو بارێکی ئەم ڕێچکە ئەدەبی‌یانە بە وردی دیراسە ئەکەن‌و بنچینەی ڕێگان بۆ پێشخستنی ئەدەب‌و بەرهەمی شـاعیران‌و نووسەرانی کورد • هەروەها هەوڵی بڵاوکردنەوەی مەنەگرافیای مێژووی ئەدەبی کوردی بە گشتی‌و مێژووی ئەدەبی بە کرمـانجی‌و سۆرانی‌و گۆرانی بەتایبەتی ئەدەن •

ملخص البحث

# دراسة الأدب الكردي في العراق

بقلم الدكتور ك. ك. كوردوييف
ترجمة وتعليق
الدكتورة شكرية رسول ابراهيم
كلية الاداب ـ جامعة السليمانية

يدور البحث حول الادب الكردي في العراق اعتبارا من مرحلة ظهور الصحافة الكردية ، والتي تبدأ كما حددها المؤلف من سنة ١٨٩٨ . ويصف كاتب المقال هذه المرحلة بانها أدت الى تطور الحركة التحررية القومية للشعب الكردي وانبعاث المشاعر القومية لدى المثقفين الكرد .

قسم كاتب المقال الفترة التي عالج فيها تطور الادب الكردي الى مراحل ثلاثة تبدأ الاولى من نهايات القرن التاسع عشر حتى نهاية الحرب العالمية الاولى او انتصار ثورة اكتوبر الاشتراكية ، ويدرس تطور الادب الكردي في هذه المرحلة من خلال الصحف والمجلات الكردية التي نشرت نتاجات عدد من الشعراء والكتاب الكرد .

أما المرحلة الثانية والتي تبدأ من مابعد الحرب العالمية الاولى وانتصار ثورة اكتوبر فتستمر حتى اوائل الثلاثينيات .

ويقول الكاتب ان الاحاسيس القومية تطورت في هذه المرحلة ولاسيما بعد اقامة امارة كردستان الجنوبية في سنوات ١٩١٩ ـ ١٩٢١ . ويدرس الكاتب هذه المرحلة كذلك من خلال الصحف والمطبوعات الكردية التي ادت الى نشر نتاجات الشعراء وسائر النتاجات الادبية من مقالات وغيرها. وقد استشهد بالعديد من هذه النتاجات لعرض افكاره ووجهات نظره .

اما المرحلة الثالثة فقد حدد الكاتب بدايتها بالثلاثينيات واعتبرها مستمرة حتى الان • ويدعى ان هذه المرحلة قد تمخضت عن ظهورها دراسات علمية واسعة ونتاجات ادبية كثيرة ونتاجات اجتماعية • ويعطي في هذا المجال أهمية خاصة لكتاب المرحوم الاستاذ رفيق حلمي (الشعر والادبيات الكردية) الذي ظهر جزؤه الاول في سنة ١٩٤١ •

ويتحدث بعد ذلك عن كتاب (تاريخ الادب الكردي) الذي ظهر في بداية الخمسينيات • ويتحدث كذلك عن نتاجات عدد من المثقفين الاكراد امثال كريم شارەزا ومحمد الملا عبدالكريم ومعروف خزندار وعزالدين مصطفى رسول واحسان فؤاد وعبدالرزاق بيمار ••• الخ ويحلل ابرز نتاجاتهم •

كما يخصص جانبا من مقاله لدور المؤتمرات الادبية في تطور الادب الكردي ، ويتحدث عن أهمية بيان الحادي‌عشر من آذار ١٩٧٠ ونتاجات المرحلة التي اعقبت صدور ذلك البيان الذي اقر الحقوق القومية والثقافية للشعب الكردي •

وقد حدد كاتب المقال الدكتور ك• ك• كوردوييف النقاط التالية في تحديد مسار الادب الكردي وتطوره :

١ـ تحليل تأريخ الادب الكردي •

٢ـ تحليل مواد النتاج الشعري •

٣ـ تحليل بعض نتاجات الشعراء •

٤ـ دراسة سيرة حياة الشعراء الاكراد في العراق •

٥ـ طبع ونشر الدراسات التحليلية عن الادب الكردي في العراق وترجمة النماذج الادبية الى العربية •

وفي ختام البحث يتحدث صاحب المقال عن دور الاستشراق السوفيتي

في مجال الدراسات الكردية وتحليل الادب الكردي ونشر نماذج عنه وبحث الاعمال التي تتحدث عن تاريخ الادب الكردي وبصورة خاصة الادب الكردي في اللهجة الكرمانجية الجنوبية •

وقد علقت المترجمة في نقاط عديدة على بعض ما ورد في المقال وقدمت بعض الايضاحات اللازمة وصححت الاخطاء التي وردت فيه •

# جەنگنامەی خالید

**محەمەد عەلی قەرەداغی**
**ئامادەی کردوەو پێشەکیی بۆ نووسیوە**

## پێشـــەکی

سامانی کەلەپووری ئەدەبی کوردی ـ جگە لەوەی بـەشی هــەرە زۆری لەناوچووەو پێش ئەوەی سوودی خۆی ببەخشێ ناوی کوێربووەتەوە ، ئەوەشی مابێتەوەو لە فەوتان رزگار بووبێ هێشتا زۆری‌وای ماوە بۆی نەلواوە تـۆزی لەبیرچوون‌و ، خۆڵ‌و دۆرنجی ناو ئاق‌و سنووقە کۆنەکانی لێ بتەکێنرێ‌و بـە دەستی خوێندەواران بگەیەنرێ . ئەوەتا ئەبینین زۆر جار لەم‌لاو لەولاوە شتی‌وا دەرئەکەوێ‌و سەر هەڵئەدا کە ئەم بەرەی خوێندەواری کوردە هیچ هەواڵێکی لێی نیەو ناویشی نەبیستووە .

لەم ماوەیەدا لای برادەرێکەوە دەسخەتێکی بچکۆلەم دەست‌کەوت ، سێ نامیلکەی بە لەهجەی گۆرانی (هەورامی) تێدایە . نامیلکەی یەکەم : **( حیکایەتی شێخی صەنعان )** بوو لە ژمارە (٦٧)ی گۆڤاری ( رۆشنبیری نوێ )ی نیسان‌و مارتی ١٩٧٨دا بلاوم‌کردەوە . نامیلکەی دووهەم : **(جەنگ‌نامەی خالید)** ـ ئەم نامیلکەی ئێستە پێشکەشتـان دەکـرێ . نامیلـکەی سێهـەم : دانـراوی **(بێسارانی)**یەو لە باسی قەبرو قیامەت ئەدوێ ، داومەتە خزمەت مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس بە ئومێدی ئـەوەی لەگەڵ دیـوانی (بێســارانی)دا بلاوبکرێتەوە .

ئەم نامیلکەیە ـ جەنگ‌نامەی خالید ـ بەگوێرەی ناوەکـەی‌و هەنـدێ ڕواڵەتی .. چیرۆکێکی ئایینی‌یەو ، پاڵەوانەکانی لە پیاوانی ئایینی ئیسـلام‌و دوژمنانی ئەوان هەڵبژێرراون . بەلام چیرۆکی ئایینیی کوردی وەك باسێـکی سەربەخۆ شەقڵ‌و ڕەوت‌و قۆناغ‌و هەنگـاوەکانی دیـاری نـەکراوەو ، لـەو سەرچاوانەی لە ئەدەبی کوردی دەدوێن‌و لە هەندێ ڕووی دەکۆڵنـەوە تەنهـا **(مێژووی ئەدەبی کوردی)**ی مامۆستـا عەلائـەددین سەججـادی‌و **( ئـەدەبی فۆلکلۆری کوردی)**ی د. عیززەدین مستەفام دی لایەك لە ئەفسانەو داستان‌و چیرۆکی کوردی بکەنەوەو ، لە بەربەڕۆچکەی ئاسۆی لێکۆڵینەوەدا هەندێکیان

هەڵس‌وکەوت پێ بکەن‌و لێیان وردببنەوە ، کەچی ئەوانیش بە شێوەیەکی جیاواز لە **چیرۆکی ئایینیی کوردی** نەکۆڵیونەتەوەو ، ئەم بەشەی ئەدەبی کوردی وەك بوخچەی نەکراوە ماوەتەوەو ئەرك‌و زانیاری‌یەکی باشی ئەوێ تا ـ ئەگەر لەتوانادا بێت ـ بنەوان‌و سەرچاوەکانی بدۆزرێنەوەو ، مەبەستی ڕاستی ڕوون بکرێتەوەو ، مێژووی کات‌و جێگای چیرۆکەکان بزانرێن‌و ، هەروەها ئەو شێوەو لەهجانەی چیرۆکەکانیان پێ‌گوتراوە دیاری بکرێن .

بە چاوپێدا خشاندنێکی هەندێك لە چیرۆکی ئایینیی کوردی یەك دوو شت دەردەکەون ئەمەوێ پەنجەیان بۆ ڕابکێشم :

**١ـ ئەو چیرۆکانە خزمەتی مەبەستێکی مەزهەبیی تایبەتی‌یان پێ کراوەو لە ڕێگەی ئەو چیرۆکانەوە دیعایە بۆ مەزهەب‌و کۆمەڵێك کراوە . بۆ ئەم قسەیە دیاری‌ترین بەڵگە چیرۆکی ( فەتحی قەڵای خەیبەر )ە ، کە ئەبینین لەو چیرۆکەدا چ‌ئەندازەیەك ئازایەتی‌و چالاکی‌و پاڵەوانەتیی ( ئیمامی عەلی ) دیاری کراوەو ، چەند دەوری بەرز کراوەتەوە ، تەنانەت پێغەمبەر (د) کە سەرکردەو بەشداری فیعلیی شەڕەکە بووەو تیایدا بریندار بووە ... ناوێکی ئەوتۆی نیەو ڕەنگە زیاتر دەوری دۆعاگۆیی ئیمامی عەلیی دراببێتێ تا سەرکردەیی شەڕ و فەتح ! زیاد لەوەی ناوی زۆر لە صەحابە گەورەکان ؛ وەك ئیمامی عومەرو ئەبووبەکرو ... تاد دیار نیەو باسی ئازایەتی‌یان نەکراوە کە دەوری ئەوانیش لە دەوری ئیمامی عەلی شتێکی نەگەڕاوەتەوە .**

**هەروەها بەسەرهاتی محەممەد حەنیفەو ئەو چیرۆکەی بۆی دروست‌کراوە کە ڕەنگە هەر شتی نزیك لەوەش دەربارەی ئەو لە مێژووی ئیسلامدا نەبووبێ‌و ڕووی نەدابێ ـ بەڵگەیەکی‌تری ئەم قسەیە .**

٢ـ زۆربەی ئەم چیرۆکانە لە قاڵبێکی ئەفسانەییدان‌و بیرو هەستی ئەفسانە نووسانە باڵی بەسەر تەواوی ڕووداوەکاندا کێشاوەو ئەو شتانەی پاڵ قارەمانانی چیرۆکەکان دەدرێن لە ئاوی مێژووی ئیسلامی ئاو ناخۆنەوە .

لێرەوە بیرم بۆ ئەوە ئەچێ بڵێم : ئەم باسانە ئەفسانەن‌و قارەمانەکانیان لە پیاوە ناودارەکانی ئیسلام وەرگیراون‌و لە هەندێ جێگەدا زۆرترو لە هەندێکی‌تردا کەمتر جەنگ‌و ڕووداوەکانی مێژووی ئیسلامیان بە موبالەغەوە تێ‌هەڵکێش کراوە . وەك ئەوەی ئەم چیرۆکانە لە ئەفسانەو چیرۆکی کۆنی پێش ئیسلام وەرگیرابن‌و مەهەلاو هەوێنی ئەو چیرۆکانەی پێشو ئەمان بگرسێنێ .

مامۆستا عەلائەددین سەججادی لەم بارەیەوە دەڵێ : « ئەو جۆرە مانعایە کە یۆنان یا ئەورووپا لە بابەت چیرۆکەوە لێی ئەداتەوە من بەرامبەر بە چیرۆکی کوردی ناتوانم ئەو مانعایە لێ‌بدەمەوە، ناتوانم بڵێم سەرەتا لە ڕووی شعوورێکی

ئایینی‌یەوە بۆ خواکان یا بۆ بوتەکانیان داناوە ، بەڵکو هەر لەسەر ئەوەم کە کارەساتی ئەشکەوتەکان‌و ژیانی ساویلکەی ڕۆژانەکەی خۆیان بووە گێڕاویانەتەوە، لە پاشا بەپێی درێژبوونەوەی زەمان‌و گۆڕانی ژیان چیرۆکی‌تری‌وا هاتووەتە پێشەوە کە هینەکانی پێشووی لە فکر بردووەتەوەو قاڵبی ئەم لەگەڵ زەوقی ئەو ژیانەیانا چاکتر ڕێکەوتوە ... کە دەوری ئیسلامیش هاتووەتە پێشەوە ناوە کۆنەکان گۆڕاونەتەوە بە ناوی ئیسلامی‌و لە پاش ئەویش هیی‌تری هاتووەتە سەر . ئەم قسەشە پێچەوانەی ئەوە نیە کە چیرۆکی ئایینی‌یان نەبووە. هێزەکانی تەبیعی‌و چاکەو خراپەو تاریکی‌و ڕووناکی گەلێ چیرۆکی بۆ خستوونەتە ناوەوە . بەڵام مەبەستەکەی ئێمە پێش ئەم تەئریخەشە » (۱).

**بنج‌و زمانی ئەم چیرۆکانە :**

دێینە سەر ئەوەی ئەم چیرۆکانە لە ئەسڵدا هەر بە زمانی کوردین‌و زادەی هەست‌و بیری ئەم دانەرانەی ئێستەن یان لە زمان‌و سەرچاوەی‌ترەوە وەرگیراون ؟

وەڵامی ئەم پرسیارە بێ بەڵگەی باش نادرێتەوە . بەڵگەیش بۆ مەبەستێکی وا ئاڵۆز ئاسان نیە ، چونکە کەم لەو دانەرانە لە پێشەکیی چیرۆکەکانیاندا قسەیان لە ناوو ناونیشانی خۆیان کردووە ، بەڵکو هەر دوای صەلات‌و سەلام ڕاستەوخۆ لەگەڵ چیرۆکەکە تێ‌هەڵچوون‌و تا دوایی دەسبەرداری نەبوون . بەڵام پاش بیرکردنەوەو گەڕان بۆرە قەناعەتێك بەوە پەیدا دەبێ کە زۆربەی ئەم چیرۆکانە کاتی خۆی بە لەهجەی گۆرانی دانراون‌و ڕەنگە ڕەگیشیان لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا لە قووڵەوە بێت‌و ئەم چیرۆکانەی ئێستە چەکەرەی سەر کۆتەرەی ئەو ڕەگە کۆنە بن‌و ، بە لەهجەی کرمانجیی خوارو موتوربە کرابن‌و ئەم بەرهەمانەی ئێستەیان لێ دەرچووبێ .

۱ــ چیرۆکی **(فەتحی قەڵای خەیبەر)** کە تا ئێستە بە لەهجەی کرمانجیی خواروو سێ جار چاپ‌کراوە ، (۲) بەڵام وادیارە لە ئەسڵدا بە لەهجەی گۆرانی بێت ، چونکە مامۆستا زێوەر ئەم چیرۆکەی بە ناونیشانی **(فەتحول‌خەیبەر)** لە گۆرانی‌یەوە کردووە بە کرمانجیی خوارو (۳) .

۲ــ هەروەها **کتێبی شێخی صەنعان** کە عەبدوسسەلام حەیدەری ئەڵێ

---

(۱) بڕوانە : عەلائەدین سوججادی ، مێژووی ئەدەبی کوردی ، چاپخانەی مەعاریف ، بەغدا ، ۱۳۷۱ هـ ۱۹۵۲ م ، ل : ۸۷ ــ ۸۸ .

(۲) بڕوانە : نەریمان ، ببلیۆگرافیای کتێبی کوردی ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ، بەغدا ، ۱۹۷۷ .

(۳) بڕوانە : گەلاوێژ ، ژمارە (۱) ، ساڵی (۱۰) ، ل : ٥٠ .

له فارسی‌یه‌وه کردوویه به کوردی ، (٤) ئه‌میش ئه‌سله‌گۆرانی‌یه‌که‌ی ــ وه‌ك له پێشدا باسم کرد ــ لای من هه‌یه .

له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌شدا گه‌لێ چیرۆکی ئاینی ئه‌مێننه‌وه پێویستیان به لێکۆڵینه‌وه‌ی زۆر هه‌یه تا بنج‌و بنه‌وانیان بدۆزرێته‌وه .

**دانه‌ری ( جه‌نگ‌نامه‌ی خالید ) کێیه ؟**

ئه‌و ده‌سخه‌ته‌ی من ئه‌م چیرۆکه‌م له‌به‌ر نووسییه‌وه هیچ باسێك له دانه‌ره‌که‌ی ناکات‌و ناوی که‌سی ــ جگه له نووسه‌ره‌که‌ی ــ به‌سه‌ره‌وه نییه ، ئه‌مه‌ش یه‌که‌م کتێبی کوردی نیه ناوی دانه‌ری نه‌زانرێ ، زۆر له چیرۆکه کۆنه‌کان ناوی دانه‌ریان به سه‌ره‌وه نه‌نووسراوه‌و ناشزانرێن ، وه‌ك ئه‌بینین ماموستا عه‌لائه‌دین سوجادیش ناوی کۆمه‌ڵێك له چیرۆکه کۆنه‌کان ئه‌نووسێت، به‌لام له‌پێشه‌وه ئه‌ڵێت : «من لێره‌دا ناوی هه‌ندێکیان دێنم ، به‌لام هێشتا خاوه‌نه‌کانیانم بۆ ساغ نه‌بووه‌ته‌وه . » (٥) .

نه‌زانینی ناوی دانه‌ری چیرۆکی کوردی ــ یان چیرۆکی ئاینیی کوردی ــ چه‌ند هۆیه‌کی هه‌یه ، له‌سه‌رووی ئه‌و هۆیانه‌وه :

١ــ دانه‌ره‌کانیان له سه‌ره‌تاوه ــ له‌به‌ر هه‌رچی بێ ــ ناوی خۆیان نه‌بردووه ، ئه‌مه له کاتێکدا زۆر له دانه‌رانی هاوچه‌رخی ئه‌م دانه‌رانه‌ی کوردو ــ هه‌ر له ناو کوردیشدا ــ له سه‌ره‌تای کتێبه‌کانیانه‌وه ناوی خۆیان ئه‌ڵێن‌و ، هه‌ندێ جار بنه‌ماڵه‌و تیره‌و شوێنیشیان دیاری ئه‌که‌ن . به‌لام وه‌ك دانه‌رانی ئه‌م چیرۆکانه نه‌یان‌ویستبێ ناوی خۆیان بهێنن وایه . ره‌نگه ئه‌م مه‌سه‌له تا ئه‌م ماوه‌ی دواییش هاتبێ . پێشتر باسی ماموستا زێوه‌ریشمان کرد که ( فه‌تحول خه‌یبه‌ر)ی له گۆرانیه‌وه کردووه به سۆرانی ، به‌لام له ژێر ناوی موسته‌عاردا . (٦)

---

(٤) بروانه : عه‌بدوسه‌لام حه‌یده‌ری ، کتێبی شێخی صه‌نعان‌و به‌سه‌رهاتینی شێخی صه‌نعان ، چاپخانه‌ی ته‌ره‌قی ، که‌رکوك ، ١٣٩٣ هجری ١٩٧٣ میلادی .

(٥) بروانه : سه‌رچاوه‌ی ژماره : یه‌ك ، ل : ١٣٥ .

(٦) ره‌نگه ماموستا زێوه‌ر له‌و چاوه‌وه سه‌یری ئه‌و چیرۆکانه‌ی کردبێ که که‌ره‌سه‌ی نان‌په‌یداکردنی هه‌نده‌که‌سێك بوون‌و له دیوه‌خانان‌و گوێ‌ئاگردانی مزگه‌وتان‌و چاخانه‌کاندا خوێندوونیانه‌ته‌وه‌و نانیان پێوه‌خواردوون‌و ده‌وری شایه‌رو حیکایه‌تخوانیان دیوه‌و ، ئه‌ویش پێی نه‌نگ بوه له‌و جۆره که‌سانه بژمێررێ ، یان‌یارمه‌تی کاره‌که‌یان بدات ... به‌لام

٢ـ ئەو نووسەرانەی نوسخەیان لەبەر دانراوەکان هەڵگرتووەتەوە بە هیچ شێوەیەك ئیشارەیان بۆ لای ناوی دانەر نەکردووە ، ڕەنگیشە نووسەری وا بووبێ دانەری چیرۆکەکەی ناسیبێ یان ناوی زانیبێ ، بەڵام ئەویش ناوی نەهێناوە ، ئیتر : ساخۆی لە خۆیەوە کەمتەرخەمی کردبێ‌و ناوەکەی پشت‌گوێ خستبێ ، یان ئەوەی زانیبێ کە دانەر حەزی نەکردووە ناوی ببرێ بۆیە ئەمیش ناوی نەهێناوە !

## مێژووی دانانی ئەم نامیلکە :

وەك ناوی دانەری (جەنگ‌نامەی خالید)مان نەزانی زیاتر لە عاستی زانینی مێژووی دانانەکەیدا تەم‌و تاریکی ڕێگامان لێ لێڵ ئەکات‌و ، تروسکە رۆشناییەك نیە دەساگیرسێنی لێ‌بکەینەوەو ڕێچکەیەك بدۆزینەوە بەرەو مەبەستمان بەرێت. تەنها ئەوەندە هەیە نووسەرەکەی ئەڵێت لە ساڵی ١٣١٩ ای کۆچیدا نوسیویەتیەوە . دوایش داوای لێ بوردن ئەکات ئەگەر غەڵەت‌و شت ببێ لە نووسراوەکەیدا ، چونکە خەتای ئەو نیەو نوسخەی ئەسڵی ناتەواو بووە . ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە پێش ١٣١٩ ای ك دانراوە ، بەڵام چ‌کات ؟ نازانرێ !

## نوسخەی تری ئەم جەنگ‌نامە هەیە ؟

ئەوەندەی من گەڕاوم‌و سەرچاوەم خوێندووەتەوە ناوی ئەم نامیلکەم نەدیوە ، لە هەرکەسیشم پرسیوەو باسی ناوو ناوەرۆکیم لا کردووە بەلایەوە شتێکی نەبیستراو بووەو هیچ شتێکی دەربارەی نەزانیوە ، واتە : لەم نوسخەی خۆم زیاتر نوسخەم دەست‌نەکەوتووەو بە گوێرەی ئاگاداری من تا ئێستە نوسخەیەکی تری دیار نیە .

## نرخی ئەم نامیلکە :

ئەم نامیلکە چاوگێکە شەڕو هەرایەك ئەگێڕێتەوەو قارەمانەکانی لە موسوڵمانانی سەرەتای ئیسلام‌و گاورانی (فەڕەنگ) هەڵئەبژێرێ‌و ، ناوی قارەمانە ئیسلامییەکان ئاشکراو ناسراون . بەڵام لەمە بەولاوە نە جێگەی شەڕەکەو نە ئەو کەسانەی کافران کە شەڕیان لەگەڵ موسوڵمانەکان کردووە

---

لەو ڕووەوە کە ئەم چیرۆکانە نموونەیەکی ئەدەبی کوردی کۆنمان بۆ ڕوون ئەکەنەوەو ، شەقڵ‌و ڕەوتی چیرۆکی کۆنی کوردیمان بۆ ئەگێڕنەوە ، بە پێویستی زانیوە ، وەك بەشێك لە سامانی کەلەپووری نەتەوایەتی ، بایەخێکی تایبەتی‌یان پێ‌بدرێ‌و بژێنرێنەوە .

ـ بێجگە لە (قەیلوول)و (قەراڵ)و (زەمزەم) ـ ناوی کەسی تریان نیە ، ئەم سێ ناوەش کێن و پادشاو سەرۆکی کام وڵاتن ؟ لە چیرۆکەکەوە نازانرێ . بۆیە چیرۆکەکە ، وەك وتم ، چیرۆکێکی ئایینیە ، بەڵام بیرو هەستی ئەفسانەیی باڵی بەسەر رووداوەکاندا کێشاوەو، ئەگەر چیرۆکەکە لەگەڵ مێژووی ئیسلامیدا رووبەڕوو بکرێتەوە رەنگە هیچ جۆگەو بنەوانێکی لە سەرچاوەی مێژووی ئیسلامدا نەبێت . واتە : لەم بارەوە کە بڵێین چیرۆکێکی ئیسلامییەو لاپەڕەیەکی مێژووی ئیسلام بە کوردی بۆ گەلی کورد روون ئەکاتەوە ئەوە هیچو دەست لەوەی ئەشۆین .

ئەمێنێتەوە ئەوەی کە ئەم نامیلکە بەشێکە لە سامانی کەلەپووری ئەدەبی کوردیو ، شەقڵو شێوەی سەردەمێکی مێژووی ئەدەبی کوردی پێوەیەو ، ئەگەر بۆی بلوێ لەبارەی لێکۆڵینەوەی **(چیرۆکی ئایینیی کوردی)**یەوە بایەخێکی تایبەتی هەیەو ، لەم رووەوە جێگای خۆی ئەگرێتو ، ئەگەر لەمەودوایش شتی تازەی لەبارەوە بزانرێت ئەوە رەنگە لەو شتەتازانە نـاوی دانـەرەکەی بزانرێو بەوەش ناوی ئەو زانایە زیندو بکرێتەوەو لەناو پیـاوانو نـاودارانی کوردو زانایانی کورددا جێگەو رێزی خۆی بۆ دیاری بکرێت .

### کاری من لەدەرخستنی ئەم نامیلکەدا :

پاش ئەوەی بە گوێرەی هەوڵو توانا گەڕامو هیچم دەست نەکەوتو ، دانکەنی ئەوە بووم نوسخەیەکی تری ئەم نامیلکەم دەست بکەوێتو ، پێی ئەوەم خست بگەمە زانیاریو شتی زیاتر دەربارەی دانـەرو کاتی دانانیو ... تاد هاتمە سەر ئەوەی ئێستە هەرچۆن هەیە ئەم نامیلکە بگۆڕمە سـەر رێنووسی کوردیو وەك تێکستێکی کۆن پێشکەشی خوێندەوارانی بکەمو ، وەك هەنگاوێکی تازە لە بارەی چیرۆکی کوردییـەوە پێشچاوی ئەو کەسانەی بخەم بـە تەنگ لێکۆڵینەوەی ئەم جۆرە مەبەستەوەن .

پاش چەند سەرنجێکی دەسنووسەکە بۆم دەرکەوت گەلێ هەڵەی تێدایەو وادیارە نووسەرەکەی ، یان هەر وەك خۆی نووسیویەتیەوە ، یان گەلێ هەڵەی سەیری کردووە کە هەندێکیان ناشارەزایی نووسەر لە زمانی عەرەبیدا پیشان ئەدەن ؛ وەك نووسینی ( غزا = غەزا ) بە ( غظا ) ، ئەمەش لە زیاد لە جێگەیەکدا، بۆیە هاتم بۆ ئەم هەڵـە ئاشکرایانە رێبازێکم گرتـە بەر کە بریتییە لەوەی : هەڵەکەم لە تێکستەکەدا راستکردەوەو لە خوارەوە بە ( أ ) واتە : ئەسـڵ ، ئیشارەم بۆ هەڵەکە کردو هەڵەکەم وەك خۆی بە رێنووسە کۆنەکە روونووس کرد .

لە هەندێ جێگەشدا لەنگیو نارێکی لەکێشو قافیەدا هەیـە ، هەندێکیم

لەپەراوێزدا دیاریکردووە ، بۆ ئەودوایشی بە دانانی نیشانەی (!) خوێنەرم ئاگادار کردووەتەوە .

لە کۆتاییشدا فەرهەنگۆکێکی بچکۆلەم بۆ هەندێك لە وشەکانی کردووە .

بۆ ئەوەیش تێکستەکە ، بە گوێرەی توانا ، بە ڕێکی بنووسرێتەوەو لە هەڵە رزگار ببێت ، تەنها بەخۆم پشتەسوور نەبووم‌و تێکستەکەم سەرلەبەر لەگەڵ مامۆستا محەمەدی مەلا کەریمدا خوێندووەتەوەو ، گەلێ جێگەی بۆ راستکردمەوە کە ئەگەر ئەو نەبوایە ـ بە تایبەتی لەبارەی شێوەی هەورامییەوە ـ ئەو جێگایانەم بەسەردا تێدەپەڕی .

**باسێکی دەسخەتەکە :**

ئەم دەسخەتە محیدێنی مەلا محەمەد صاڵحی ژانی (٧) نووسیویەتیەوە ، دەسخەتەکە سێ نامیلکەی تێدایە ، تێکرا (١٠٧) لاپەڕەیە ، لە ساڵی ١٣١٩ی کۆچیدا نووسراوەتەوە، نامیلکەی یەکەم : حیکایەتی شێخی صەنعانە . نامیلکەی دووهەم ئەم نامیلکەیە کە پێشکەشی دەکەین . دوای ئەم نامیلکە پارچەیەك شیعری مەولەوی‌و دوو پارچە شیعری ئەحمەد بەگی کۆماسی تێدایە . دوای ئەو پارچە شیعرانە نامیلکەی سێهەمە کە دانراوی مەلا مستەفا ( بێسارانی )یە باسی قەبرو قیامەت ئەکات . تێکرای دەسخەتەکە بە لەهجەی هەورامییەو هەمووی بە یەك خەت واتە : خەتی محیدینی مەلا محەمەدصاڵحی ژانی نووسراوەتەوە .

دەسخەتەکە لەسەر شێوەی بەیازە ، زۆر بچکۆلەیە ، هەر لاپەڕەی (٨) هەشت شیعری تێدا نووسراوە . سەرەتاو کۆتایی دیارە ، بەڵام لەسەرەتاوە لاپەڕەی یەکەمی لەبەر کۆنی‌و پواوی کاغەزەکەی ناخوێنرێتەوە . لە حیکایەتی شێخی صەنعاندا لە دوو جێگەدا پەڕەیەك یان زیاتری کەوتووە .

پانایی لاپەڕەکانی (٦/٥) سانتیمەتر و درێژیشی (١٤) سانتیمەترە .

---

(٧) ژان : ـ وەك لە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسم بیست ـ گوندێکە لە نزیکی ( بێساران )ی جێگای شاعیری نەمر (بێسارانی)یەوەیە . دەڵێن : ( ژان ) و ( بێساران ) .
لە نووسینی ئەم پێشەکییەدا چەند سەرچاوەیەکی ترم خوێندوەتەوە ، بە تایبەتی کتێبی ( ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی ) دانراوی د. عیزەدین مستەفا رەسووڵ ، بەغدا ، ساڵی ١٩٧٠ ، چاپخانەی ( دار الجاحظ ) .

## کورتەیەکی چیرۆکەکە :

چیرۆکەکە پاش صەلات و سەلام وا دەست پێ دەکات : خالیدی کوڕی وەلید ژنێکی ئەبێ ناوی ( گوڵجەمین ) ئەبێ ، رۆژێ لەگەڵ خالیدا بە یەکەوە قسە ئەکەن ، گوڵجەمین بە خالید ئەڵێ : لە جیهاندا هاوتات هەیە ؟ خالید ئەڵێ : تەنها قەیلوولی کوڕی قەڕاڵ هەیە هاوشانم بێ . گوڵجەمین ئەم قسە ئەگرێتە دڵ ، بە رێکەوت قەیلوول بۆ تیجارەت دێتە مەدینە ، خالید لە ماڵەوە نابێ ، ژنی خالید ئەمە ئەبیسێ ، ئەچێتە لای قەیلوول و لەگەڵی سازئەبێ ، ئەویش هەڵی ئەگرێت و ئەیبات بۆ وڵاتی خۆی . کە خالید دێتەوە و بەسەرهات ئەزانێ ، ئەچێت بۆ وڵاتی قەیلوول و ، ئەگاتە ئەو جێگەی ژنەکەی لێیە ، رێی ئەکەوێتە ماڵی پیرەژنێك ، پیرەژنە موسوڵمان ئەبێ و بەیارمەتی کچێکی قەیلوول، کە ئەویش موسوڵمان ئەبێ ، ئەیرفێنێ و بۆی دەرئەچێ . دوایش کچەکەی قەیلوول شوێن خالید ئەکەوێت و لە رێگا ئەیگرێتەوە . دوایی سوپای کافران شوێنیان ئەکەون و ، قەیلوول و کوڕەکانیشی بەشداری ئەکەن و لە رێگادا پێیان ئەگەن و ، شەڕێکی قورس ئەقەومێ ، کچەی قەیلوول شەش براو باوکی خۆی ئەکوژێ . دوای جەنگێکی زۆرو کوشتارێکی بێ ئامان لەکافران ، کچەکە بە دەستی برای حەوتەمی خۆی ئەکوژرێت . ئینجا خالید دێتە مەیدان و شەڕو کوشتارێکی زۆر ئەکات و لە ئەنجامدا بریندار ئەبێ . بە برینداری خۆی ئەشارێتەوە ، دۆعا ئەکات حەزرەتی عومەر بە خەو ئەیبینێ و هەواڵ بە پێغەمبەر ـ د ـ ئەدات ، ئەویش جوبەی خۆی ئەدا بە حەزرەتی عەلی و لە پێشەوە ئەینێرێ بە هاواری خالیدەوە . دوایی سوپایەکی سێ هەزار کەسی رێك ئەخەن و بەشوێن حەزرەتی عەلیدا ئەڕۆن ، حەزرەتی عەلی ئەگاتە فریادی خالیدو جوبەی پێغەمبەری ـ د ـ لەبەرئەکات و برینەکانی لەشی بەتەواوی چاك ئەبنەوە .. دووبارە شەڕێکی گەورە ئەقەومێتەوەو ، کافرەکان شکست دێنن و سەرکەوتن و پیرۆزی بەشی موسوڵمانان ئەبێ . دوایی ژنەکەی خالید دێننە خزمەت پێغەمبەر ، ذولفەقار ئەخاتە سەر سەری ، چونکە هیچ ئیمانی لە دڵدا نابێ ذولفەقار دووکەرتی ئەکات . دوایی خالید دڵی بە مناڵەکانی ئەسووتێت و سکاڵای خۆی و مناڵە وردەکانی لای پێغەمبەر ئەکات . پێغەمبەر دۆعای بۆ ئەکات و کچەکەی قەیلوولی ـ کە بەدەستی برای حەوتەمی خۆی کوژرابوو ـ بۆ زیندو ئەکاتەوەو پێغەمبەر لە خالیدی مارە ئەکات . بەم جۆرە چیرۆکەکە کۆتایی دێت .

بسم الله الرحمن الرحيم

صەبوور سەتتار ......

سەمیع بەصیر ، صەبوور سەتتار

یا ڕازیق ڕیزق کولل مەخلووقات

یا عالیمەلغەیب سیڕڕو خەفییات

یا حەی ، یا قەییووم ، فەرد سوبحانی

ئاوەردت وجوود ئەی دنیای فانی

یا ڕەب بە حاجەت نوور پەیغەمەر

بیاوەم وە داد نە ڕۆز مەحشەر

بدەرەم تەوفیق ( رب العالمین )

بەخشە[1] گونای بەندەی کەمتەرین

یاڵلا بە حاجەت سی جزمەی قورئان

قەطرێوە لەذیذ بووزیم نە دەهان

قەطرێ جە ڕەحمەت عەطا کەی پێمان

تا بە ئەو قەطرە گۆیا بۆ زوبان

گۆیا بۆ زوبان بە قەطرەی شیرین

کەرۆ مەدح خالید شێر سەهمگین

(۱) بەخشە ( أ ) بەبخشە .

ئەر بدۆ تەوفیق ، بینای بان سەر ،
فەردێ جە دەروون بەرئاروو وەبەر
بکەروون تەعریف ( سیف [٢] الله )ی ڕەشید
چ تەور قڕ کەردەن گەوران پەلید
بەیان کەم ئیعجاز سەیید سەروەر
شەفاخوای ئوممەت دیوان مەحشەر
هەم ئیمام[٣] عەلی صاحیب ( ذوالفقار )
حەیدەر صەفدەر شێر کردگار
چێشش کەرد چەنی گەوران مردار
واوەیلای سەخت وست نە ئەهل کوففار
هەم زەن خالید ( گوڵجەمین ) نام بی
صاحیب خەطو خاڵ شیرین ئەندام بی
ڕوێ چەنی خالید نیشتەبین وە هەم
مداشان وە باد کۆی خەرمان غەم
زەن وات : ئەی خالید ، شێر هونەروەر
هەمتای تۆ کەس هەن* نە عالەم یەکسەر ؟
گۆیا جە لای ناز ئەو مکەرد گوفتار
نەزانا بە حیلەش شێر نامدار !

---

(٢) سیف ( أ ) صیف .

(٣) لێرەدا نامەوێ ئەوە ببوێرم کە نووسەر ( ئیمام )ی بە (ایمام ) نووسیوە، واتە ( یـ )ی لە باتی ژێر ، (کەسرە) بەکار هێناوە ، ئەمە ئەوە ئەگەیەنێت نووسەر ــ بێ ئەوەی خۆی هەستی پێ بکات ــ گوێتەقەی ڕێنووسێکی کوردی دەکات .

* کەس هەن ( أ ) بە ڕێنووسی نوێ : کەسەن .

ئاما نه گوفتار شێر زەبەردەس :
هامتای من نیەن نه دنیا هیچ کەس
بەڵێ شەخصێ هەن [٤] وڵات کوففار
نامش قەیلوولەن فرزەند قەرار [٥] ..

زەن بەدبەخت قصه نه دڵ شکاوا
تا فرزەند قەراڵ بە ئەو شار یاوا

ڕوێ جه تەقدیر پادشای ئەکبەر
خالید هۆرێزا کەرد عەزم سەفەر

پەی عەزم سەفەر کەمەر بەست ئەو پەشت
شمشێر ، حەمایل ، نێزە گرت بە دەست

بە تاوو تەعجیل بە ئەسپ سوار بی
ڕاهی بی نه ڕاه خوداش بۆ چەنی

ئەوسه جه دما بشنەوە خەبەر
جەی حاڵو کردار بیەر باخەبەر

نەو طەرەف قەیلوول فرزەند قەرار
عەزم سوود ئاما پەی مەدینه شار

بارکەردن تەمام قەطار مەهار
ڕاهی بین نه ڕاه نەکەردن مدار

شەبو ڕۆ نەکەرد ئەو گەور مردار
تا ئاخر یاوا وه مەدینه شار

---

(٤) ( هەن ... ) ڕەنگە لەدوایەوە (جه) یەك کەوتبێ‌و (هەن جه ...) بووبێ.
(٥) له شیعرەکاندا هەندێ جار (قەرار)و هەندێ‌جار (قەرال) نووسـراوە ، بۆیه ئێمەش وەك خۆی هێشتمانەوە .

غەوغا کەفت بە ناو شار مەدینە
فرزەند قەڕاڵ ئاوەرد مەتای خەزینە [٦]

ناگاه زەن خالید ئەژنی ئەی خەبەر
هۆرێزا وە پا جە ماڵ شی وە بەر

ئەو زەن خەبیث مەردوود بێ حەیا
جە یانە بەرشی نەکەرد مدارا [٧]

تا یاوا بە ناو قەطارو مەهار
دیش کە نیشتەن مەلعوون مردار

ئاما نیشت وەلاش بە عیززو نیاز
وات چەندێ [٨] وەختەن ئەی شای سەرئەفراز

سەجدەم نەبەردەن خودای موسوڵمان
ئامانم وەسەر دین کافران

وەقتێ ئەو مەلعوون ئەی خەبەر ئەژنی
هەفت قەطار تەمام داش بە مزگانی

گاڵ دا غولامان بارکەردن قەطار
جە موژدەی ئەی حەرف نەکەردش مدار

زەن هۆرگرت [٩] لەعین مەردوود مردار
قەطار بارکەردن بەرشین جە ناو شار

---

(٦) ئەم نیوە شیعرە لەنگە .
(٧) مدارا (أ) : مدرا .
(٨) چەندێ ( أ ) چەند .
(٩) هۆرگرت ( أ ) هورکرد .

نە بە ڕۆ ئارام ، نە بە شەو قەرار
تا یاوا ولاٚت مەحاڵ کوففار

تەمام مەخلووقات ئامان وە پێش‌واز ،
بەردشان بە شار بە صەد عیززو ناز

بابۆش گەنجو ماڵ تەمام کەرد نیثار
غەنی کەرد یەکسەر تەمام ئەهل شار

ئەوسە جەو دما بشنەوە خەبەر
جە حاڵ خالید شێر هونەروەر

جە ڕاگەی سەفەر ئاماوە بە خەیر
نیگا کەرد زەنش نەدارۆ ئەثەر

وات بە فرزەندان : گوڵجەمین جە کۆن ؟
پەی چێش جە یانە ئەو نەدارۆ شۆن ؟

عەرض کەرد : ئەی بابە نەدارین خەبەر
جەو ڕۆ تۆ لوای پەی ڕاگەی سەفەر

ئەویچ دمای تۆ نەدیمان بە ڕەنگ
مواچان قەیلوول بەردەن پەی فەرەنگ

خالید چون ئەژنی ئەی سوخەن بە گۆش
چون دیگ پڕتاو جۆشیا بە جۆش

ئارام پێش نەمەند ، هۆرێزا وە پا
ئاما بە حوضوور شاه ئەنبیا (١٠)

---

(١٠) نەمەند (أ) نەمەندەن . پا (أ) پاه . ئەنبیا (أ) انبیاه .

سەلام کەرد وە شای ڕەسوول کەونەین
ڕەسوول عەلەیك سەند بە لەفظ شیرین
واتش : یا رەسوول ، سەیید سادات
هەزار وێنەی من ببۆ بە فیدات ،
کارێ عەجیبم بەسەر ویەردەن
قەیلوول کوففار زەن من بەردەن
ئەگەر لوطفت هەن بدەرەم دەستوور
بشوون پەی غەزای [11] گەوران بەد توور [12]
فەرماشا : مشی خودا یارت بۆ
فریشتان عەرش [13] نیگەهدارت بۆ
خالید دەرلەحظە رووکەرد ئەو دما
هیممەت واست جە شای ( خیرالانبیا )
لوا تەویلە ، ئەسپش بەرئاوەر [14]
پەی عەزم سەفەر ببەستش کەمەر
موکەممەل بوراق ئەسپش بکەرد زین
پەنا بەرد بە ذات ( رب العالمین )
قەڵخانو باهوو نێزە گرت [15] بە دەست
شمشێر میصری وە میانش بەست

(11) غەزای ( أ ) غظا .
(12) بەد توور [ بەد طەور ] ( أ ) بد نور .
(13) لە ئەسڵەکەدا تەنها (ش)ێك هەیەو لە پێشیەوە شتێك کوژاوەتەوە ، هەڵئەگرێ ( عەر )بێتو هەڵیشئەگرێ ( را )بێت .
(14) بەرئاوەر ( أ ) برآورد .
(15) گرت ( أ ) کرد .

مەندیل کافوور داش نە دەور سەر
چەم قەطرانی کەرد شێر پڕ هونەر

سوار بی وە ئەسپ وێنەی نەڕەشێر
دنیا نە دیدەش بی وە سیاقیر

مەنزڵ بە مەنزڵ قەطرە دا بە جەخت
مداراش نەبی بە وەقتو بێوەقت

شەبو ڕۆ نەکەرد ، نەکەرد مدارا
پەناهـ بە ذات پادشای دارا

یاوا بە سەرحەد (١٦) وڵات کوففار
قەلعەی حەصارش تەمام دا دیار

جە دڵ وات : ئیمشەو جە کۆ میهمان بوو ؟
جە ئەهل کوففار کەس پێم نەزانو

دیش تەنیا ماڵێ جە کەنار شار
ڕوو کەرد بە ئەو ماڵ نەکەردش مدار

یاوا بە یانە جە ئەسپ بی پیا
دیش یەك پیرەزەن وە بیروون ئاما

ئاما بە زوبان بە لەفظ تەمام
واتش : ئەی دایە پڕ عەقڵو پڕ فام

ئەر قەبووڵتەن میهمانت ببوو
ئیمشەو میهمانم من بە یانەی توو

---

(١٦)سەرحەد ( أ ) سەرحەت .

دایه وات : بەڵێ هەر خالید نەبۆ
میهمان عەزیزەن وە بان چەم بۆ !

خالید چون ئەژنی ئەی واتەی کردار
چەنی پیرەزەن ئاما بە گوفتار

وات : خالید کیەن ، مەکانش جە کۆن ؟
چمان ئەو خالید خوونەخوارەی تۆن !

ئیسە ئەر خالید بگنۆ بە دەستت
بواچە بە من تەمام قەصتت

واتش : ئەی جەوان شەکەرین گوفتار
بواچوون قسەی خالید جادووکار

فرزەند قەڕال یەك ڕۆ بی سوار
شی پەرێ صەحرا بە عەزم شکار

دوو نەفەر فرزەند بەرگوزیدەی من
هەر دوو عەزیزان نوور دیدەی من

هۆرێزان هەردوو بە عەزم شکار
چەنی سوپاو سان هەردوو بین سوار

ئاما وە ڕاشان خالید جادووکار
کەفت نە دلێشان چون شێر خونخوار

بە نێزەوو (۱۷) تێغ شمشێر ئابدار
ئەو سوپاو ئەو سان یەکسەر کەرد قەلار

---

(۱۷) نێزەوو (أ) نیزو .

فرزەندان من وە بێ چەندو چوون
هەردوو بە یەك جار کەردش سەرنگوون

ئەر بگنۆ دەستم ئەو شێر ژیان
تەنخوای فرزەندان مستانووش گیان

خالید وات : دایە صاحیب کەمالاَن
بە پای وێم ئامام کەفتم نە دامان

منم ئەو خالید شێر ڕۆی هەیجا
ناستم زیندە کەس بەیۆ بە دما

هەرچی مواچی بەندە میهمانەن
میهمان ڕەنجیدەن خەیلێ گوناهەن (!)

دایە ئێد شنەفت ساتێ بی مەدهۆش
جە دمای ساتێ باز ئاما بە هۆش

واتش : ئەی خالید شێر هونەروەر
کەلیمەی شادەت پەنەم نیشان دەر

خەبەر چۆن ئەژنی ئەو جە پیرەزاڵ
بەی کارو کردار تەمام بی خۆش‌حاڵ

بە صیدق‌و ئیخلاص ئیمان پێش ئاوەرد
کەلیمەی شادەت بە ئەو تەلقین کەرد

یەك دوختەرش بی هەم ئاوەرد ئیمان
بە صیدق‌و ئیخلاص ببی موسولمان

خالیدو دایە دوختەر چەنی هەم
نیشتن بە دڵشاد هەر سێشان بە هەم

خالید وات : دایه مەکەرە مدار
بە دەوانو دەو بشۆ وە بازاڕ

بەعزێ[18] جەو طەعام میوەی رەنگاو ڕەنگ
باوەرە پەرێم بێ صەبرو درەنگ

دەست بەرد وە هەگبە چەند دانەی جەوهەر
سپەردش بە دەست ئەو دایەی دڵبەر

پیرەزاڵ ئەژنی ڕوو کەرد بە بازاڕ
چەندێ طەعامات کەردش خرِیدار

ڕوو کەرد وە دما پیر ناتەوان
ئاوەرد پەی خالید بەور ڕۆی مەیدان

بنیشتن بە هەم هەرسێشان بە شــاد
تا صوبح صادق هەرچی بادا باد

سەحەر[19] هۆرێزا ( سیف‌الله )ی ڕەشید
ڕوو کەرد وە ناو شار گەوران پەلید

بەرگ دەروێشی پۆشا بە ئەندام
پەنا بەرد بە ذات حەییی لایەنام

ڕشتەی دەروێشی دا نە دەور سەر
پرچش شانە کەرد شێر نامەوەر

---

(١٨) بەعزێ ( أ ) بعظی .
(١٩) سەحەر ( أ ) صەحەر .

ڕوو کەرد وەقاپیی قەڕاڵ بەددین [۲۰]
نیگا کەر قودرەت ( رب‌العالمین )

جوستوجۆ کەردش نەو قاپیی حەصار
هەر چەند نیگا کەرد کەس نەبی دیار

جە چەند قادرمان ئەو لوا بەسەر
دیش شەخصیٚ مدران چون ماهـ ئەنوەر

خەط‌و خاڵ شیرین نازدار فەڕەنگ
مەحبووب بیٚ عەیب ، باڵا شۆخ‌و شەنگ

خالید دیش بە چەم ئەو پەری‌ڕوخسار
بە تیر عیشقش دڵ کەرد گرفتار

چەندیٚ جیٚ‌وەرتەر ئەو حۆری ڕوخسار
دیەبیٚش نە خاو خالید نامدار

جە خەوف بابۆش ، جە شەرم حوضوور
باطین ئامابی بە دین ڕەسوول (!)

خودای ئاسمان بەرحەق مزانا
دین گەورانش باطیل موانا

خالید دی بە چەم سەوڵ [۲۱] خەرامان
دەرلاد شناساش نازدار باوان

---

(۲۰) بەددین ( أ ) بدین . ئەم وشەیە بەم شێوە نووسراوەو لێرە بە دواوەیش چەند جار هەر بەم شێوەیە دێت کە بۆ (بەددین)یـشو (بیٚ‌دیـن)یـش دەست‌ئەدات .

(۲۱) سەوڵ ( أ ) صەوڵ .

دەرساعەت ئاما کەفت نە خاكپاش
صەد جار رۆح وێش بکەردش فیداش

واتش : ئەی خالید ئامان صەد ئامان !
پەی چێش ئامانی بەی مەئوای گەوران ؟!

بزانۆ بابۆ چەنی برادەر
تۆ جە دەستشان موینی زەرەر

خالید چون ئەژنی ئەی حەرف گوفتار
تەبەسسومێ کەرد شێر نامدار

ئاما بە جەواب وات : پڕعەقڵو فام
پەی چە ! تۆ کێنی ؟ ڕاس واچە وەلام

ئەو دوختەر واتش : رۆحم بۆ فیدات ،
رازو حاڵ وێم عەرز کەروو وەلات :

ئەمن دوختەرم بابۆم [٢٢] قەڕاڵەن
صاحیب سوپاو سام گورزو گۆپاڵەن

دوو ساڵ تەمامەن ئاوەردم ئیمان
بە دین گەوران وێم کەرد پەشیمان

ئامای نە خوابم تۆ چەنی رەسوول
دین گەورانم نەکەردەن قەبوول

ئیسە بزانوو موددەعات چێشەن
پەی ئامات خەیاڵێ دڵ نە تەشویشەن

---

(٢٢) بابۆم (أ) بابۆن .

خالید حیکایەت جە سەر تا بە وار
کەردش پەی دوختەر سەوڵ سایەدار
دوختەر دا جەواب وێنەی سەوڵ [۲۳] تەڕ
واتش: ئەی خالید شێر پڕهونەر !
ئەگەر تۆ تاوای عیلاجش کەردی
ئەو فاحیشەی قەحبە بە دەر ئاوەردی
ڕووکەر بە دما چون شێر هەیجا
بەندە هەم مەیوو بە عەون ئەڵڵا ✻
( والحاصل ) خالید ڕوو کەرد وە سەرا
دیش کە زەن وێش وە بیروون ئاما
سوئال کەرد وەنەش واتش : ئەی خاتوون !
چیزێ بدەر پێم ، وە بێ چەندو چوون
زەن شنەفت دەرلاد نەکەردش مدار
زاناش خالیدەن بەور نامدار
دەرساعەت دەرلاد لوا بە یانە
پەرێش ئاوەرد چەند جەواهیر دانە
خالید دەست نەبەرد پەی زەڕو تەلا
پەوکێ نیا لێش ، وات : ئەی بێ حەیا !
ڕووسیای عام بای جە ئینە بەتەر
سەرئەفگەندە بای جە لای پێغەمەر

---

(۲۳) سەوڵ : لە هەردوو جێگەکەدا ( صول ) نووسراوە .

✻ لە نێوان ئەم شیعرەو شیعری دواییدا هەست بە بچڕانو بێڕەبتی یەك دەکرێت .

زەن کە ئێد شنەفت سیا بی جە قار
بکەردش هاوار نە قەوم کوففار

خالید کە زاناش بانگش کرد بڵەند
دەست بەرد حەلقش گرت [٢٤] بوستش نە دەنگ

پێچاش چون شاباز شکار کەرۆ بەند
بەستش دەستو پاش بە حەڵقەی کەمەند

گرتش بە ئاغۆش ئاوەرد ئەو دما
درووديٚ کیانا پەریٚ مستەفـا

ڕووکەرد بە یانەی دایەی وەفادار
دەرلاد سوار بی نەکەردش مدار

فـاحیشەی بیٚشەرم ئەو بە نارەزا
کێشا نە تەرکەش روو نیا بە ڕا

هیممەتخواهی کەرد ئەو جە پیرەزەن
وات : ڕووسفید بای جە لای خوداوەند

نەکەردش مدار ڕوو نیا نە ڕا
پەنا بەرد بە ذات حەیی بیٚ هەمتا

وەقتیٚ ئەو دوختەر ئەژنی ئەی خەبەر
ڕوو کەرد بە دەرگای دانای دادگەر

ئاخێزا نە جا صاحیب عەقڵو فام
بەرگ مەردانە پۆشا بە ئەنـدام

---

(٢٤) گرت (أ) کرد . لەم جێگەو چەند جێگەی تریشدا لە باتي ( گرت ) (کرد = گرد ) نووسراوە . ئێمە ڕاستمانکردەوە .

شمشێر بەست نە پشت ، تێزە گرت بە دەست ،
ئیسپەر نە باهوو وێنەی شێر مەست

ڕووکەرد بە یانە پەی خەرجی سەفەر
پاشکۆ پڕ بکەرد جە طەلای [٢٥] ئەحمەر

شی پەی تەویلە ئەسپش بەرئاوەرد
بە تاوو تەعجیل زین ئەسپش کەرد

پا دا نە ریکاب بە ئەسپ بی سوار
هەی کەرد بە مەرکەب بە وێنەی باڵدار

سوار بی وە ئەسپ سەوڵ خەرامان
کەفت نە شۆن نەعل شێر بێ ئامان

خالید نیگا کەرد دیش نە ڕاگەی دوور
سوارێ مەیۆ چون شەماڵەی نوور

خالید وات : ئەڵبەت گومکەردەی ڕاهەن
وەقتێ یاوا دیش کناچەی شاهەن

دوختەر سەلام کەرد ، خالید سەلام سەند
وات : ڕوو سفید بای جە لای خوداوەند

بە شادیو خورڕەم ڕوو نیان بە ڕا
شین بە سەر ئاوێ گرتشان مەئوا

دەستنماز سەندن بە عەزم نماز
بەردن سەجدەی ذات حەیی بێ نیاز

---

(٢٥) طەلای ( أ ) طلاو .

خالید بی ڕاحەت ، سەر نیا بە خاو
دوختەر ڕای گەوران مداشتنش بە چاو

وەفتێ نیگا کەرد سەحراو دەشتو دەر
سەراسەر تەمام پڕ بی جە لەشکەر

چون بەحر قولزوم لەف مدا نە لەف
مامان بە هەمدا صەفا صەف صەف صەف [٢٦]

دوختەر خجڵ مەند جەی کارو کردار
واتش : من خالید چوون کەروو بێدار ؟ !

ڕوو کەرد بە دەرگای ( قاضي الحاجات )
بە دیدەی گریان کەردش موناجات

دۆعاش قەبووڵ بی جە لای کردگار
جە یومن ڕەسوول خالید بی بێدار

دوختەر وات : خالید ! نیگا کەر سەحرا
ئاوردن پەی جەنگ سوپای کینەخوا

واتش : خەوف مەکەر پەنا بە داوەر
هیچ باکم نیەن جەی سوپاو لەشکەر

دوختەر وات : خالید هیچ مەبەر غەمگین
تۆ پەرێ سوپا مەخرۆشە بە قین

نیگا کەر بە عەون دانای کردگار
جە سوپای گەوران بەرئاروو دەمار

---

(٢٦) لەف مدا نە لەف : ڕەنگبێ (کەف مدا نە کەف) بێ . هەمدا (أ) هەمدان.

تا کە ئەی قسە ویەرد جە مابەین
سوپای کافران لێشان نزدیك بین

دەرلاد هۆرێزا مەحبووب نازدار
دەست دا نە شمشێر بڕندەی ئابدار

لوا نە مەیدان گەوران جەنگی
نیشت نە دلێشان چون سام سەنگی

نەعرەتەش پێکا وێنەی هەور تار
واتش ئەی گەوران مەردوود مردار

بە عەون خودا دانای کردگار
نمازوو لێتان ئەصلەن یەك سوار

شمشێر میصری کێشا نە خیلاف
دەس دا بە شمشێر بێ لافو گەزاف

نیشت نە مەلعوونان گەوران بەددین
بە ضەربێ چەند کەس وست نە ڕووی زەمین

شمشێر ئابدار بە هەرکەس مشەند
مەلەك نامەی مەرگ دەرلاد پێش موەند

ناگاە جە یەك لا یەك برای بێ دێن
گەور حەق نەشناس کافر لەعین

چون دێو جەنگی کەف مدا نە دەم
ئاما پەی خواهەر ، ئەژدەهای ئەرقەم

واتش بە خواهەر : ئەرێ بێ حەیا !
شەرتبۆ جە مەیدان سەرت کەم جیا

کناچە واتش : لەعین مردار
سەرت جە مەیدان کەروو لەتو پار

ئینشاڵڵا بە عەون گەردانای گەردوون
وێتو چەنی فیل کەروو سەرنگوون

ئێد واتو دەرلاد دەست دا بە شمشێر
گەرمش کەرد مەیدان وێنەی نەڕەشێر

بەردش نە هەوا شمشێر ئابدار
دا نەگەردنش بە زۆر زۆردار

وەقتێ دا وەنەش تێغ ئابدار
کەردش بە دوو لەت بە وێنەی خەیار

چون گەوران دیشان ئەی کار کردار
تەمام بە یەك جار ئەوان بین سوار

ئەویچ چون زاناش سەوڵ خەرامان
دەست بەرد پەرێ تێغ بڕندەی بێ‌ئامان

زایەڵەی عەظیم وست نە ڕووی مەیدان
چەند کەس نگوون کەرد جە نامەوەران [۲۷]

ثانی یەك براش وە فیل بی سوار
ئاما پەی خواهەر چون شێر زامدار

ئێد هەم بە تەعجیل ڕوو نیا پەرێش
دەست دا بە شمشێر بێ وەهمو ئەندێش

---

(۲۷) نامەوەران (أ) نام‌ئاوەران .

بەردش نە هەوا شمشێر چەنی دەست
دا نە گەردەنش وێنەی شێر مەست

وێش و چەنی فیل غەڵتان کەرد نە خاك
بە عەون خودای فەرد تەنیای تاك

( والحاصل ) تا ظوهر سەوڵ خەرامان
کوشتش شەش برای بێ دین و ئیمان

تا ئاخر بابۆش خێزیا بە قین
جۆشا خرۆشا مەردوود بێ دین

ئاما پەی دوختەر وێنەی ئەژدەها
گورز سەهمگین بەرد نە ڕووی هەوا

مەحبووب نازدار دەردەم یاوا پێش
ئەدەبش نەکەرد ئەو نە بابۆی وێش

دەست بەرد پەرێ تێغ نازدار فەڕەنگ
دا نە فەرق سەر قەڕاڵ بەدڕەنگ (٢٨)

وێش و چەنی فیل کەردش نگوونسار
جە یومن ئیقباڵ ڕەسوول نازدار

گەوران تەمامی خرۆشان بە قار
کەردن مەغلووبە کەس نەبی دیار

دوختەر کە زاناش وادەی نەبەردەن
گەوران پەرێ ئەو مەغلووبە کەردەن

---

(٢٨) (بەدڕەنگ) ئاوا (بدرنگ) نووسراوە ، هەڵیش ئەگرێ (بێدرەنگ) بێت .

دەست دا بە شمشێر بە دەوان دۆ
وستش وە گەوران واوەیلاو ڕۆڕۆ

باز هەم برای‌تەر وە فیل بی سوار
ڕوو کەرد وە مەیدان عەرصەی کارزار

نامش زەمزەم بی گەور نابەکار
ئاما پەی خواهەر ، لەعین مردار

گورزێ دا وەنەش ئەو گەور پەلید
بە ضەرب گورزش بکەردش شەهید

وەقتێ ئەو شاد بی بە ڕەوضەی ڕیضوان
نۆبەی خالید بی بشۆ بە مەیدان

دەرلاد کە زاناش دوختەر بی شەهید
ئاخێزا نە جا (سیف الله)ی ڕەشید

خەشمش جۆشیا وە ئەسپ بی سوار
ڕوو کەرد وە مەیدان عەرصەی کارزار

زۆر دا وە سەمەند چون رۆستەم زاڵ
دەست دا نە باهوو پەی گورزو گۆپاڵ

واتش : یا داوەر حەبیبی کردگار
بدەرەم تەوفیق سرپۆش سەتتار

تەنیا کەفتەنان نە عەرصەی گەوران
کەس نیەن هانام بەرۆ پەی یاران

ئێد واتو دەردەم دەست دا بە شەمشیر
ڕووکەرد وە سوپای گەوران بێ پیر

نیشت وه قۆشەن [۲۹] گەوران بێ‌دین
بە ضەربێ چەند کەس وست نە ڕووی زەمین

بە ضەرب صەمصام حەربەی قەدارە
گەوران مکەردش بە چەهار پارە

دەور مدا بە دەور چون شمقارِ پەی قاز
چون شاباز پەی کەو بەیۆ نە پەرواز

مدرا نە مەیدان نرکنا چون شیر
مداشان بە هەم حەربەی [۳۰] تێغ‌و تیر

ئەوان چەند هەزار ئێد یەک نەفەر بی
چونکە لوطف حەق چەنیش یاوەر بی

کەردن مەغلووبە گەوران مردار
گرتن دەورا دەور شێر نامدار

خالید وێنەی بەور نە مەیدان کار
نەعرەتەش پێکا چون هەور بەهار

بە ضەرب حەربەی تێزەی جان ستان
مکەرد قەتل‌و عام شێر بێ‌ئامان

ئاخر جە تەقدیر حەیی جیهان‌گیر
زەخمین بی ئەعزاش بە تێغ‌و بە تیر

بەو جەستەی هوونین شمشێر مشانا
موەند نام ذات یەکتای تەوانا

---

(۲۹) قۆشەن (أ) قوشن .
(۳۰) حەربەی (أ) مربە .

چەند کەس لێشان کوشت ئاخر سەرەنجام
فایەق بین نە سەر شێر لایەنام

چونکە ڕەزاش [٣١] بی بینای بیهتەرین
خالید جە مەرکەب کەفت بە ڕووی زەمین

جە ئیعجاز خاص ڕەسوول سەروەر
نەبیشان فرسەت بکەراش بێسەر

چونکە خوداوەند پۆسەش بی ڕەزا
حەیدەر بیاوۆ بکەرۆ غەزا

خالید دەست هۆرداشت عەزم موناجات
لالاّ نە دەرگای ( قاضي الحاجات )

واتش : یا داوەر قەییووم دانا
یەکتای بێ هەمتا ذات تەوانـــا !

یا ئاگاە بە حاڵ کولل مەخلووقات
فەرد فریاڕەس تەمامیی ئەشیات !

چێش عیلاج کەروو جە دەست گەوران
کەس نیەن هانام بەرۆ پەی یاران !

کۆن ئیمام عەلی صاحیب ذولفەقار
بیاوۆ پەنەم شێر کردگار ؟

مالیكو زوبەیر شێر ڕووی مەیدان
پەنەم بیاوان چون هەردە جاران ...

---

(٣١) ڕەزاش ( أ ) راضاش .

دووەم وات : یا حەی فەرد لایەنام
فەرد فریادڕەس ئەشیای کولل تەمام

خەبەردار کەری ئەصحابان دین
بیاوان پەنەم نە مەیدان کین

ئەوسە جەو دما بپەرسە خەبەر
جە حاڵو ئەحواڵ ببە باخەبەر

ڕوێ جە تەقدیر بینای بانسەر
شی نە شیرین خاو ئیمام عومەر

ئاما نە خوابش خالید بە زویر
سەرتاپای ئەعزاش پڕ بیەن بە تیر

بکەردش هاوار واتش : یا عومەر
بیاوان پەنەم نە عەرصەی خەتەر

عومەر نە خاودا لەرزاو ستێزا
جە خواب شیرین دەرساعەت خێزا

دەرلاد هۆرێزا نەکەردش مدار
ئاما بە حوضوور ڕەسوول موختار

مدرا بە پاوە بکەردش سەلام
ڕەسوول عەلەیك سەند بە لەفظ تەمام

واتش : یا ڕەسوول ئارۆ شیم نە خواب
خالید دیم بە چەم کەفتەن بە گێج ئاب

پاسە مزانوو خوابم دەلیلەن
خالید هەم بە دەست گەوران زەلیلەن

چون ئەژنی ئەی حەرف شای خەیرولئەنام
عاجز بی زویر ، مەعلووم بی تەمام

ئاما بە زوبان ڕەسوول نازدار
فەرما : باوەران شای دولدوڵ سوار

دەرلاد حازر [32] بیشێر کردگار
ئاما بە حوضوور ڕەسوول نازدار

فەرما : یا عەلی خالید ها نە جەنگ
گەوران ڕووی مەصاف وەنەش کەردن تەنگ

مدارا مەکەر تۆ بشۆ بە ڕا
وێم چەنی یاران مەونە نە دمـــا

چون خەبەر ئەژنی ئەو شێر جەبیار
پەنا بەرد بە ذات یەکتای کردگار

ئاما وە زوبان واتش : یا ئەڵڵا
بە تۆمان سپەرد خالید ئینشەڵڵا

عەلی وات : قەمەر ! زین کەرە دولدول
باوەرە پەرێم ، کار بیەن موشکڵ

قەمەر بە تەعجیل زین کەردش دولدول
ئاوەرد پەی عەلی شێر بێ بەدەڵ (!)

عەلی هۆرێزا نەکەرد مدارا
ذولفەقار هۆرگرت بە ئەمر خودا

---

(٣٢) حازر ( أ ) حاظر .

سوار بی وە ئەسپ صاحێب ذولفەقار
ئاما بە حوضوور مستەفای موختار

هیممەت ستانا جە ڕەسوولەڵلا
ڕەسولەڵلا وات : حەق ببۆت هەمڕا

جوبیەی شەریفش جە بەدەن کەندش
بەدەست عەلی دەرلار سپەردش

فەرما : ئەی جوببە ببەرە (٣٣) پەرێش
بکەرۆ نەوەر زامش بۆ سارێژ

جوببەش سەند ، بۆسا نیا فەرق سەر
هیممەت واست جە لای سەیید سەروەر

ڕاهی بی نە ڕاە شێر کردگار
دوڵدوڵ نیشت وەباڵ وێنەی باڵدار

پا دا بە ڕیکاب شێر نامدار
ئومێد بەست بە ذات یەکتای کردگار

چەند شەوو چەند ڕۆ نەکەردش مدار
تا یاوا (٣٤) مەیدان مەعرەکەی کوففار

یاوا عەرصەگاهـ عەلی شای مەردان
دی چەند سەر بێ لاش کەفتەن نە مەیدان

چەندێ دوو لەتەن گەوران مردار
چەند جە نامداران کریان تارو مار

---

(٣٣) ببەرە ( أ ) بەبرە .
(٣٤) یاوا ( أ ) یا .

به تاقی زاناش ئەی قەتڵ کوففار
کەردەی خالیدەن شێر نامدار

واتش : ئافەرین خالید وەلید
بمانی پەی قەتڵ گەوران پەلید

جە شادی غەزای خالد هۆرێزا
گێلا نەو صەحرا بکەردش پەیدا

وەختێ نیگا کەرد نە مەیدان کار
سەرتاپای ئەعزاش بیەن زەخمدار

دیش کە نیم نەفەس مخێزۆ تاو تاو [٣٥]
شی نە بالینش بە دیدەی پڕئاو

حەیدەر دیا دیش [٣٦] زامش ناسۆرەن :
جای تیرەن ،جای ڕم ، حەربەی ساتۆرەن

بەر ئاوەرد جوببەی سەیید سەروەر
واتش : بە خالید بکەرش نەوەر

خالید جوببەش سەند بکەردش نەوەر
زامش بی سارێش جە ئەووەڵ خاستەر

دەرلاد [٣٧] هۆرێزا خالید وەلی
بۆسا دەستو پای ئیمام عەلی

---

(٣٥) ئەم نیوە شیعرەم بە بۆچوونی خوم نووسی‌یەوە ، بۆیە بە ڕێنووسـەکەی خۆیشی لێرەدا دەینووسم : « دیشکە نیم مخیزو تاو تاو » . دیـارە ( نیم )ەکە ( نیم نەفەس ) بووە .

(٣٦) دیش ( أ ) دلیش .

(٣٧) دەرلاد ( أ ) در .

شای مەردان پەرسا جە خالید خەبەر
ئەحوالات ڕا جە پا تا وەسەر

خالید حیکایەت سەراسەر [٣٨] تەمام
عەرض‌کەرد بە خزمەت شێر لایەنام

ئەو شەو بی ڕاحەت گرتشان [٣٩] کەنار
تا شوعلەی خورشید صوبح بی ئاشکار

هۆرێزان وضوو تازە گرتشان
سەجدە جە دەرگای داوەر بەردشان

جەو دما صەلەوات دان بە رووی رەسوول
ئاداب‌و تەرتیب [٤٠] لێشان بی قەبووڵ

ئەسلەحەو ئەسباب پۆشاشان * نەوەر
رووکەردن بە شۆن گەوران سەگ‌خوەر

جە دوور دین بە چەم گەوران ناپاك
پشت بەستن بە ذات حەیی تەنیای تاك

پا دان نە ڕیکاب شێران پڕکین
تا یاوان بە ناو گەوران بێ‌دین

عەلی چون یاوا بە ئەو مەلعوونان
نەهیب دا لێشان شێر بێ ئامان

---

(٣٨) سەراسەر ( أ ) سرسر .
(٣٩) گرتشان ( أ ) گرتشار .
(٤٠) تەرتیب ( أ ) ترطیب .
* پۆشاشان (أ) پۆشاشا . دیارە (ن)ەکەی بەهۆی (ن)ی (نەوەر)ەوە نەنووسراوە .

دەست بەرد ذولفەقار کێشا نە خیلاف
نیشت نە مەلعوونان بێ لافو گەزاف

خالید بەرئاوەرد نێزەی جانستان
وست وە مەلعوونان فریادو فوغان

چون شمقارِ وە قاز نیشتن وە سوپاهـ
ئاوەردن بە تەنگ گەوران بەدخواهـ

عەلی بە وێنەی ڕەعد وەهاران
نەعرەی حەیدەریش کێشا نە جیهان

وات : ئەی طایفەی گەوران بێدین
کارێ کەم پێتان نە ڕووی سەرزەمین

چطەور زاناتان حەیدەر نەمەندەن
ئێوە پەی خالید هوجوومتان کەردەن

یە ئامام پەیتان چون بادو باران
کەرووتان وە پەند نە عەرصەی مەیدان

خالید نەعرەتە کێشا وێنەی شیر
وات : ئەی کافران مەردان بێ پیر (٤١)

ئەگەر مزانان ئینە چێش نامەن
حەیدەر صەفدەر ئەسدوڵڵا نامەن

ئێد واتن دەست دان بە تێغ هوونڕێز
وستن نە گەوران ڕۆز ڕەستاخێز

---

(٤١) پیر (أ) بیر ٠

وێنەی باڵدار دەور مدا لێشان
چەند نەفەر کوشتن جە کینە کێشان

چەند جە کافران کەردن لەت و پار
بە ضەرب صەمصام حەربەی ذولفەقار

جە هاژەی خەدەنگ شەفاف سەرنەی
جە نەعرەی عەلی ، خالید هەیا هەی

جە گرمەی دوڵدوڵ ئاما وە پەرواز
دەور مدان پێشان چون شمقارِ وە قاز

بادا بمانۆ حەیدەر نە غەزا (٤٢)
تاکە بیاوۆ شاهـ ئەنبیـــا

ئەوسا گۆش بدەر جە حاڵ تەقریر
جە کردار حەی بینای بێ نەظیر

بشنەو چێشش کەرد ڕەسوول سەروەر
جەو ڕۆ کە حەیدەر بەر لوا وە بەر

فەرما وە بیلال جارِ کێشا نە شار
ئەصحابان جەم بین پەی غەزای کوففار

جەو دما ڕەسوول وێش ببی (٤٣) سوار
کەفتن نە پێ سەر موهاجرو ئەنسار

بە ذیکرو تەوحید قەطرە دان بە جەخت
طەی کەردن راهان بە وەقت و بێ وەقت

---

(٤٢) غەزا (أ) غظا .
(٤٣) ببی (أ) بەبی .

جەو طەرەف خالید چەنی شای مەردان
کوشتار مکەردەن نە سوپای گەوران

دیان بەلاوە ناگاهـ هەر جە دوور
سوپاهێ مەیۆ چون شەماڵەی نوور

دیان سێ هەزار ئەصحابان دین
جە زێر پاشان ملەرزا زەمین

حەضرەت وە پێشرەو یاران سەراسەر
مەیۆ بە ڕاوە سەیید سەروەر

خالید چون زانا * سوپای یارانەن
جۆیای ڕەزمو کین ئەو کافرانەن

جە شادی سەرش پا دا بە کەیوان
مهمێز دا فەرەس چون بادو باران

یاوا بە حەضرەت پیا بی نە زین
ڕوو ماڵا نە خاك سوپای سەرزەمین

ئاما بە جەواب بە لەفظـ شیرین
تەواضوع کەردش شای رەفرەف نشین

خالید سوار کەردن بە ئیعزاز خاص
مۆبەت کەرد جێشان ئەو شای بێ قیاس

جیا بین جە هەم چەندێ جە یاران
شین نە عەرصەگاهـ پەی قەتڵ گەوران

---

* زانا (ا) زانــان .

هەر یەك تێغ تیز كێشاشان بە تاو
هەم تیر پڕتاو گورز مووشكاو
هەر یەك جە لایێ كێشان نەعرەی قار
ڕێزان نە مەیدان سەر چون وەڵك دار
سەعیدو سالم سەعد [٤٤] بن وەققاص
مالیكو زوبەیر صاحێب دین خاص
هەم عەبدوڕڕەحمان بەبر نامەوەر
محەممەد حەنیفە وێنەی شێر نەڕ
ماباقی ئەصحاب هەر یەك جە لایێ
هەر یەك زیاتر نە ئەژدەهایێ
عەلی وێنەی شێر دەور مدا لێشان
ضەرب ذولفەقار مشانا لێشان
« خالد وینەء برّ برّ او نروی میدان » [٤٥]
هەیا هەی مكەشت نە ئەهل گەوران
حەضرەت ڕەسوول بە لەفظ شیرین
دۆعای خێر مكەرد پەی یاران دین
داشان بە هەمدا تێزەی جانستان
حەربەی تێغ تێز بڕندەی بێ‌ئامان
هەر یەك جە لایێ نەعرە دان بە قین
هەر یەك چەند سوار وستن نە زەمین

---

(٤٤) سەعد (أ) صعد .
(٤٥) ئەم نیوە شیعرەم بۆ ساخ نەكرایەوە . ڕەنگە ئاوابێ :
**« خالید وێنەی بەور ئەو نە ڕووی مەیدان »**

جه هەی هەی نەبەرد یەلان پڕکین [٤٦]
سەر چون گەلاّی دار ڕێزا بە زەمین

بی وە گەردو تۆز ڕووی عەرصەی مەیدان
یەك طەبەق غوبار ڕووکەرد بە ئاسمان

مەلایك موەند ( انا فتحنا )
نــەصرەت دا پێشان حەیی بێ هەمتا

صەدای ئەلئەمان خێزا جە لەشکەر
هوون جاری وێنەی بەحران بێ دەر

چون بەحر جەیحوون نە وەقت بەهار
لاشە مبەردش چون دەریای خونخوار

سوپای کافران جە ڕووی عەرصەگاھ
شکیا شکست وەرد سەراسەر سوپاھ

دەست کەردن فەریاد گەوران بێ دین
هەر کام پەی وێشان یەکسەر فیرار بین

ڕوو کەردن دما بێزار بین جە کار
بە دادو بێداد بە هاوار هاوار

فەتح موبارەك یاوا بە ئیسلام
جە یومن ڕەسوول شای والا [٤٧] مەقام

ئەصحابان تەمام سەجدەی حەق بەردن
هەر یەك جام مەی ئەحمەدی وەردن

---

(٤٦) یەلان ( أ ) وێلان .
(٤٧) والا ( أ ) ولا .

ئامانْ بە حوضوور شای خەیرولئەنام
کەفتن خاكپاش ئەصحابان تەمام

جەو دما خالید روو ئاوەرد وە پێش
دوو دیدەش بۆسا شای کورسی نشین (!)

ئاما بە جەواب ڕەسوول سەروەر
وات : زەن خالید باوەردێ وە بەر

فەرما ذولفەقار باوەردێ پەرێم
کەروون ئیمتیحان تا مەعلووم بۆ لێم

ئەر زەڕڕێ ئیمان مەندەبۆ جە لاش
بە ئەمر خودا نمەبۆ سزاش

نەو دەم ذولفەقار ئاوەردن پەرێش
نیا فەوق سەر ئەو زەن بەدکێش

چون نەمەندەبێش زەڕڕە جە ئیمان
کەردش بە دوو لەت جە سەر تا دامان

ڕۆحش پەرواز کەرد پەی ( نار السقر )
تەنش دان وە بەحر پەرێ جانەوەر

جەو دما خالید کەفت نە خەیالان
وات : من چێش کەروو چەنی ئەطفالان ؟!
عەرض کەرد : یا ڕەسوول پەی ڕازیی ئەللا
دەردت دان ؛ مبۆ بدەریش دەوا (٤٨)

---

(٤٨) دەوا ( ا ) دواە .

فرزەندان من مادەر نەداران
مرێزان نە چەم ئەسرین چون باران

ڕەسوول وات : خالید هەرچی موازی
بە تەوفیق حەق مبۆ کارسازی

عەرض کەرد : ئەو دوختەر قەڕاڵ سەگسار
ئامابێش نە خواب ڕەسوول نازار

دەرساعەت بە دین رەسوول ئامابێ
بابۆو برادەر پێش نەزانابێ

تا ئەوە ڕۆ (٤٩) من یاوام بەو وڵات
رام کەفت وە قاپیی قەڕاڵ بەد ذات

نیگام کەرد شەخصێ چون ماه تابان
زەڕستوون قامەت چون حوور ریضوان

ئەو هەم نیگاکەرد منش دی جە دوور
ئاما نیشت بەلام چون شەماڵەی نوور

واتم : ئەی نازار یە چوون مزانی
ئەمن خالیدم نامم موانی ؟!

وات : جە خاوەدا دیەنم رەسوول
هەر جەو خاوەدا دینم کەرد قەبوول

(٤٩) ئەوەڕۆ ( أ ) اوارو ٠

ئینه یەك ساڵەن من بیم موسوڵمان
بێزارم جه دین طایفەی گەوران

هەر وەخت تۆ مشی منیچ بە هەمڕات
بەرەم بە حوضوور سەیید سادات

رویٚ من ئامام ئەو هەم بی راهی
پەنا بەرد بە ذات پاك ئیلاهی

جه غەزای کوففار ئەو بیەن شەهید
ئیستیدعام ئێدەن بە تۆمەن ئومید

دۆعا بکەری جه دەرگای داوەر
بکەری زینده پەرێم ئەو دوختەر

رەسوول وات : خالید پەنا بە [50] ئەڵڵا
گردین بە یەك جار بکەرین [51] دۆعا

ڕەسووڵ کەرد دۆعا ئەصحابان ئامین
لێشان قەبووڵ کەرد ( رب‌العالمین )

چونکه بە یەقین کەردەبین دۆعا
ئاما بە حوضوور شای ڕەسوولەڵڵا

ڕەسوول دەرساعەت عەقد ئەو بەستش
جه تەنخوای زەنش بداش بە دەستش

---

(٥٠) بە ( أ ) با .

(٥١) بکەرین ( أ ) بکرم .

جەو دما بە شاد بە فەتحو سوار
ئەصحابان ئامان پەی مەدینە شار

ماشاڵڵا لێت بۆ خالید نامدار
چوونت سەند قەصاص نە ئەهل کوففار ! (٥٢)

---

(٥٢) لە کۆتاییی دەسنووسەکەدا ئەمە نووسراوە :
« هزاران درود هزاران سلام زما بر محمد علیه سلام . تمت شد جنك نامهء خالد روز یکشنبه چهاردههم شهر ذیالحجةالحرام بتأریخ سـنه هزارو سەصدو نوزده ١٣١٩ . هر کـه خواند دعای طمع دارم زانکه من بندهء گنەکارم . حرره محیالدین بن ملا محمد صالح ژانی . هرکس این کتاب بخواند اگر غلط باشد خطا از جانب ما نیست چونکه اصل نسخەرا نا صحیح بود مارا عفو فرمایند » .
واتـە : هەزاران دروودو سـڵاو لە سـەر محەمەد بێ ــ دروودی لەسەربێ ! ــ . جەنگ نامەی خالید لە رۆژی یەكشەممەی چواردەهەمی مانگی ذیلحەججەدا بە تەئریخی ١٣١٩ تـەواو بو . چاوەڕوانی دۆعای خوێنەرانم چونکە من بەندەیەکی گوناهکارم . محێدینی کوڕی مەلا محەمەد صالحی ژانی نووسیەوە. هەرکەس ئەم کتێبەی خوێندەوە ئەگەر غەڵەتو هەڵەی تێدا بوو خەتای ئێمە نیە ، چونکە نوسخە ئەصلییەکە نادروست بوو ، ئێمە ببەخشن .
شایانی وتنە تێکستە فارسییەکەی خۆیشی، کۆمەڵێ هەڵەی ڕێزمانو ڕێنووسی تیایە .

# فەرهەنگۆك

( ئ )

**ئاخێزا** : هەڵسا .
**ئارۆ** : ئەمڕۆ .
**ئاغۆش** : باوەش .
**ئاما** : هات .
**ئامان** : هاوار .
**ئامانم** : هاتنم .
**ئامای** : هاتیت .
**ئامات** : هاتنت .
**ئاوەردت** : هێنات .
**ئەژنی** : بیستی .
**ئیسپەر** : قەڵغان .
**ئەشیات** : شتەکانت .
**ئەی** : ئەم .
**ئێد** : ئەمە .
**ئێدەن** : ئەمەیە .

( ب )

**بابۆش** : باوکی .
**باز** : دووبارە .
**بالینش** : سەرینی .
**باوەردێ** : بێنن .
**باهوو** : قۆڵ .
**بەستش** : بەستی .
**بدۆ** : بدا .
**بدەرەم** : بمدە ، بمدەرێ .
**برادەر** : برا .
**بشنەوە** : ببیسە .
**بشۆ** : بچێ ، بچێتە .
**بشوون** : بچم
**بکەرین** : بکەین .
**بکەری** : بکەی .
**بگنۆ** : بکەوێ .
**بمانێ** : بمێنێ .
**بواچە** : بڵێ .
**بواچوون** : بڵێم .
**بووزیم** : بمخەیتە .
**بوراق** : لە ئەسلا ناوی ئەسپی شەوی میعراجی پێغەمبەرە . تایبەتی یە .
**بۆسا** : ماچی کرد .
**بۆساشا** : ماچیان کرد .
**بەرئارۆ** : دەربێنێ .
**بەردش** : بردی .
**بەردشان** : بردیان .
**بەرشین** : دەرچووە .
**بەرگوزیەد** : هەڵبژاردە .
**بەور** : دڕندەیەکە .
**بیاوۆ** : بگات .
**بیاوەم** : بمگەرێ ، بگەرەفریام .
**بیروون** : دەرەوە .
**بیهتەرین** : چاتر .
**بێ پیر** : بێ قودوەو پێشرەو .

( پ )

**پاسە** : وا .
**پۆسەش** : بەو جۆرەی .
**پەرسا** : پرسی .

**پەرواز** : فڕین .
**پەرێ** : بۆ .
**پەلید** : گلاو .
**پەنەم** : پێم .
**پەوکێ** : پووکاڵاوێ .
**پەی** : بۆ .
**پیـا** : پیادە .
**پیرەزاڵ** : پیرەژن .

( ت )

**تار** : مانگی تار ، مانگیکی بەهارە ، تاریکی .
**تاوای** : توانیت .
**تەبەسسوم** : زەردەخەنە .
**تەرکەش** : تیردان .
**تەنخوا** : لـەباتی .

( ج )

**جانستان** : گیانکێش .
**جکۆن** : لەکوێیە .
**جەئینەبەتەر** : لەمە خراپتر .
**جەلای** : لەلای .
**جەی** : لەم .
**جوستوجۆ** : گەڕان .
**جۆیا** : طالیب ، ئەوەی بە دوای شتێکدا بگەڕێ .
**جێوەرتەر** : لەمە پێشتر .

( چ )

**چتەور** : چۆن .
**چمان** : وەکو .
**چەم** : چـاو .
**چەنی** : لـەگەڵ .
**چەنیهەم** : لەگەڵ یەك .
**چیزێ** : شتێ .
**چێشەن** : چییە .
**چێش** : چی .

( ح )

**حەلقش** : گەرووی .
**حەمایل** : کیسـەیێکی قایشـە ئەکرێتە مل
**حـەی** : زیندو .

( خ )

**خـاو** : خەو .
**خریدار** : کڕیار .
**خجڵ مەند** : رووگیر بوو .
**خواهەر** : خوشك .
**خورشید** : خۆر ، هەتاو .
**خەفییات** : نهێنی ، نهێنیەکان .
**خەیلێ** : زۆر .
**خێزیـا** : هەڵسـا .

( د )

**دادگەر** : عادیل .
**دا وەنەش** : لێی دا .
**درووودێ گیانا** : سڵاواتێکی نارد .
**دلێشان** : لە ناویـان .
**دمـا** : دوا .
**دمای** : دوایی .
**دوختەر** : کچ .
**دەست نماز** : دەست نوێژ .
**دەرلاد** : دەس بەجێ .
**دەردەم** :دەمو دەس .
**دەهان** : دەم .
**دیگ** : مەنجەڵ ، پاتیلە .
**دیەنم** : دیومە .

**رازیق** : بژیوەدەر .
**رشتە** : هۆنراوە .
**روێ** : رۆژێ .
**رۆز** : رۆژ .
**رۆ** : رۆژ .
**رەستاخێز** : راستبوونەوە ،
قیامەت .
**رەنجیدەن** : عاجزبوون .
**ریزق** : رۆزی ، بژیوە .
**ریکاب** : ئاوزەنگی .

( ز )

**زایەلە** : دەنگی دووری کاروان .
**زەبەردەست** : بەهێز .
**زەخمدار** : بریندار .
**زەن** : ژن .

( س )

**سان** : شەوکەت ، توانا ، پاشا .
**سپەردش** : سپاردی .
**ستانا** : سەندی ، خواستی .
**سفید** : سپی .
**سەتنار** : پۆشندە .
**سەرئەفگەندە** : سەرشۆڕ .
**سەرحەد** : سنوور ، مەرز ،
حودوود .
**سەمیع** : گۆیـا .
**سەهمگین** : ترسناك .
**سوبحانی** : خوایی .
**سوخـەن** : قسـە .
**سیـا** : رەش .
**سیـر** : پەنهـان .

( ش )

**شادیو خوررەم** : زەوقو خۆشی .
**شـکار** : نێچیر ، ڕاو .
**شـمقار** : باڵندەیەکە .
**شەب** : شـەو .
**شـۆن** : جێـگە .
**شـیم** : چـووم .

( ص )

**صەبوور** : بەصەبر .
**صەفدەر** : کەسێ زرێی دوژمن بسەێ .
**صەمصام** : شمشێر .

( ع )

**عالیمەلغەیب** : نهێنیزان ، خودا .

( ف )

**فاحیشە** : ئافرەتی خراپەکەر .
**فانی** : فەوتاو .
**فرزەنـد** : کوڕ .
**فریـادو فوغـان** : هەراو هاوار .
**فەرد** : تـاك ، خوا .

( ق )

**قادرمان** : کۆی (قادرمە)یە ، پلیکانە
**قەصتت** : قەصدت ، مەبەستت .
**قـەطرێ** : قەترەیەك .
**قـەطرێوە** : قەترەیەکەوە .
**قەلار** : قڕ .
**قەڵخان** : قەڵغان .
**قۆشەن** : لەشکر .
**قەییـوم** : خوا .

( ك )

**کارزار** : مەیدانی شەڕ .
**کنـاچە** : کچ .
**کولل** : هەمـوو .
**کۆی** : جەمع ، کۆمەڵ .

**کەردش** : کردی .
**کەرۆ** : بکات .
**کەفتن** : کەوتن .
**کەفتەنان** : کەوتووم .
**کێنی** : کێیت .

( گ )

**گرتشان** : گرتیان .
**گرتش** : گرتی .
**گۆش** : گوێ .
**گەوران** : گاوران .
**گێلا** : گەڕا .

( ل )

**لاش** : لاشە ، لای .
**لوا** : ڕۆیی .
**لوای** : ڕۆیشتی .

( م )

**مادەر** : دایك .
**ماه ئەنوەر** : مانگی رووناك .
**مبۆ** : ئەبێ .
**مدار** : وەستان .
**مدارا** : سەبر .
**مداشان** : ئەیان دا .
**مداشتش** : ئەیگرتە .
**مرێزان** : ئەڕێژن .
**مزانا** : ئەیزانی .
**مستانووش** : دەری ئەهێنم ، ئەیستێنم .
**مشی** : ئەچوو ، ئەچی .
**مشەند** : ئەوەشاند .
**مکەرد** : ئەکرد .
**ملەرزا** : ئەلەرزێ .

**مواچی** : ئەڵێیت .
**موازی** : ئەخوازی .
**موانا** : ئەیخوێندەوە .
**موددەعات** : داوات ، داخوازیت .
**مووشکاو** : ئەوەی موو بسمێ .
**موینی** : ئەبینی .
**مۆبەت** : مەحەببەت ، خۆشەویستی .
**مهمێز** : (میهماز) ئاوزەنگی .
**مەئوا** : جێگە .
**مەتا** : (مەتاع) کووتاڵ ، کەلوپەل .
**مەدهۆش** : بێهۆش .
**مەرکەب** : وڵاخی سواری .
**مەردوود** : دراوەدواوە ، بێزراو .
**مەغلووبە** : هەراو ئاژاوە .
**نەبیشان** : نەیانبوو .
**نە دیدەش** : لە چاویا .
**نەزانۆ** : نەزانێ .
**نەعرەتەش پێکا** : نەعرەتەی کێشا .
**نەمەنەن** : نەماوە .
**نەهیب** : ترس .
**نیثار** : خەڵات کردن ، نوقڵانە .
**نیشتەن** : دانیشتن .
**نیگەهدار** : چاودێر .

( و )

**واتش** : وتی .
**وار** : خوار .
**واست** : خواست .
**والا** : باڵا .
**وجوود** : بوون ، کەون .
**وست** : خستی .
**وێش** : خۆی .
**وێم** : خۆم .
**وەنەش** : هاتووە ، بەسەرچووە .

**وەنــەش :** لێی .
**ویەردەن :** تێپەڕیوە ، بەسەرچووە .

( ه )

**هانــام :** هــاوارم .
**هوونـین :** خوێنــاوی .
**هۆرداشت :** راگرت ، هەلگرت .
**هۆرگرت :** هەلـگرت .
**هۆرێزا :** راســت بووەوە .

**هەرچی بادا باد :** چی ئەبێ با ببێ .
**هەردە جاران :**جاری جاران .
**هەگبــە :** خورج .
**هەمڕات :** هاوڕێت .
**هەیجــا :** شەڕ .

( ی )

**یــانەی :** مــاڵی .
**یومن :** بەرەکەت ، پیرۆزی .

# «خۆیەتی» لە زاری سلێمانیدا

محەممەد مەعرووف فەتـاح

— ١ —

## سـەرەتایەك

تائێستە کارێکی سەربەخۆم دەربارەی «خۆیەتی»* لە کوردیدا بەرچاو نەکەوتووە • زۆربەی ئەو زمانەوانانەی لە ڕێزمانی کوردیدا کاریان کردووە، کورد بن یـا بێگانە ، هەوڵی ئەوەیان داوە بەشێوەیەکی گشتی لـە هەموو بەشــەکانی زمانی کوردی بدوێن ، یان لـە زارەکانی ، بێ‌ئەوەی خـۆیان بەتەواوی بە دیاردەیەکی دیاری‌کراوەوە ببەستنەوە و هەوڵی تەواو بدەن بۆ شی‌کردنەوەیەکی تەواو وردی ئەو دیاردەیە • ئەمە بەلای منەوە یەکێکە لـە گرنگترین کەم‌وکورتی‌یەکانی کارەکانیان • هەرچەندە ناتوانین گلەیی لەم کارە بـکەین ، چونکە لێکۆڵینەوە لـە لایەنێـکی زمان هەمیشـە دوای لێکۆڵینەوەی گشتیی ئـەو زمانە دەکەوێت • ئێسـتاکە لەپاش ئـەم کارە گشتی‌یانەی دەربارەی زمانی کوردی بلاوکراونەتەوە ، کاتی ئەوە هـاتووە زمانەوانەکانمان خۆیان تەنها بە لایەنێکی زمانی کوردی‌یەوە خەریك بکەن و

* مەبەستی خاوەن‌وتار لە زاراوەی « خۆیەتی » ئەو ئامرازانەیە کە واتای « تملك » ئەگەیەنن ـ **گۆڤار** •

تەواو لێی بکۆڵنەوەو ڕاستی‌یەکانی بخەنە ڕوو • هەر بۆ ئـــەو مەبەستەشە دەمەوێ لەم‌باســـەدا دیاردەی « خۆیەتی » لە زاری ســـلێمانیدا لە هەموو دیاردەکانی‌تری زمانی کوردی جیابکەمەوە ، بەونیازەی چەند ڕاستی‌یەکی ورد کە تائێستا یـــان باسیان نەکراوە یان بەپەلە زمانەوانەکانمان بەسەریاندا تێپەڕبوون ، بخەمە بەرچاوو هەوڵی لێکدانەوەیان بدەم •

کە دەڵێم تائێستە کارێکی سەربەخۆ دەربارەی « خۆیەتی » لەکوردیدا نەبووە ، مەبەستم ئەوە نی‌یـــە من یەکەم کەســـم لەم بارەیەوە دەنووســـم • بەپێچەوانەوە هەموو ئەوانەی لە ڕێزمانی کوردی کۆڵیونەتەوە ، لەم دیاردەیە دواون ، نیشـــانەکانی خۆیەتی‌یان دەست‌نیشان کردووەو هەنـــدێ مانای « خۆیەتی »شیان یەکالا کردۆتەوە ، بەڵام بە وردی‌و درێژی نەیان‌توانیوە لەسەر ئەم دیاردەیە بڕۆن ، چونکە مەبەستیان هەر ئەمە نەبووە ، ویستویانە هەرچی‌یەك هەیە دەربارەی زمانی کوردی بیخەنە ڕوو • هەر لەبەرئەمەش بووە کە نەیانتوانیوە بەشی تایبەتی بۆ خۆیەتی دیاری بکەن‌و کاتی تـــەواوی بۆ تەرخان‌بکەن • لەئەنجامدا دەبینین کەلێنێکی زۆر بەجێ‌ماوە کە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی وردی لەسەرخۆیە ، تاکو پڕبکرێتەوە •

## - ٢ -

## چاوخشاندنێك بەوکارانەدا
## کە لە دیاردەی « خۆیەتی » دواون

ئێرنست مەکارەس لە « ڕێزمانی کوردی »دا (١٩٥٨) ئەم ڕاستی‌یانەی دەربارەی خۆیەتی خستۆتەڕوو : (١) خۆیەتی لە کوردیدا بەهۆی پاشگرەوە دەردەبڕێت (ل ٤٩) ؛ (٢) ئەم پاشگرانە بەدوای ناوو ئاوەڵناوەوە دەلکێن

(ل ٤٩ ــ ٨١) ؛ (٣) جگه له دەوری خۆیەتی ، ئەم پاشگرانه دەبنه نیشانەی بکەرو کراویش (ل ٤٩ ــ ٥٠) •

مەکارەس ئەم ڕاستییانەی له یەك شــوێندا نەخستۆته ڕوو ( چونکه بەشێکی تایبەتیی له کتێبەکەی بۆ خۆیەتی تەرخان نەکردووه)، بەڵکو ناوبەناو لەگەڵ باس‌کردنی بەشــەکانی ئاخاوتندا تێك‌هەڵکێشــی کردوون • ئەوەی لێرەدا پێویسته بخرێته ڕوو ئەمانەن :

١ــ پاشگری خۆیەتی هەر به ئاوو ئاوەڵناوەوه نالکێت ، بەڵکو زۆر جار دەچێته سەر کۆتاییی کرداریش ( بڕوانه بەشی ٩ ) • ئەم ڕاســتییه نه مەکارەس‌و نه مەکەنزی بــۆی نەچوون ؛ ٢ــ ئەگەر پاشــگری خۆیەتی مۆرفیمێکی سەربەخۆ بێت ، ئەوه به ئاوەڵناوەوه نالکێت • ئەو نموونەیەی مەکارەس له لاپەڕه (٥٠)دا هێناویەتییەوه بەتەواوی ئەوه دەردەخات که ئەو پاشگری خۆیەتییه بــه تەنیا واتا به دەستەوه نادات ، بــەڵکو دەبێت لــه چوارچێوەی قسەکردندا وەربگیرێت • کاتێ ئاوەڵناوەکه دەگێڕینەوه نــاو چوارچێوەکەی ئەوســا بۆمان دەردەکەوێت ، که نــەك ئاوەڵناوەکه بەڵکو فرێزه ناوییەکه پاشگری خۆیەتیی وەرگرتووه ( بگره دەشکەوینه گومانەوه که ئەو پاشگره خۆیەتیی دەربڕیبێت ) • نموونەکەی مەکارەس ئەمــەیه : ( چــاکەکانم ) • بۆئــەوەی لێی تێبــگەین ، دەبێت چوارچێوەیەکی بــۆ دروست‌بکەین :

ئەمه هەموو کتێبەکانته ؟

ئەمه خراپەکانه ، چاکەکانم لێ دزرا •

لێرەدا ئاشــکرایه ، کــه ئــاوەڵناوەکه بەتەنیا پاشــگری خۆیەتیی وەرنەگرتووه ، بەڵــکو فرێزەکه ــ ( کتێبه چاکەکان ) ــ ئــەم ئــەرکەی بەجێ‌هێناوه • خۆ ئەگەر کردارەکه ــ ( لێ‌دزرا ) ــ نادیار نەبێت ، ئــەوه پاشگرەکه دەبێت به نیشانەی بکەر ، وەك لەو نموونەیەدا دەیبینین :

چاکەکانم لەسەرەوە داناوە

دیسانەوە شتێکی زۆر ئاسایی‌یە بڵێین فرێزە ناوی‌یەکە پاشگری خۆیەتی وەردەگرێت ، چونکە فرێزی ناوی پاشگری کۆو کەس‌و ژمارەو ناسیاوی وەردەگرێت :

کتێبە چاکەکە

کتێبە چاکەکان

کتێبە چاکەکانم فرۆشت

ئەو ڕۆژە خۆشانە

خۆ ئەگەر هەر سوور بین لەسەر ئەوەی کە ئاوەڵناو پاشگری خۆیەتی (وەیا پاشگری‌تر) وەردەگرێت ، دەشبێ ددان بەوەدا بنێین کە لە کاتی‌وادا هەندێ لە تایبەتی‌یەکانی خۆی دەگۆڕێت‌و ئەرکی ناو دەبینێت • بە وێنە :

چاکەکانم بە واتای ( کتێبە چاکەکانم ) دیت •

ژیرەکان بە واتای ( ئەوانەی ژیرن ) •

لاوەکانمان بە واتای ( ئەوانەی لاون لەناو ئێمەدا ••• ) •

س• ج• ئێدمەندس لە باسی « ئامرازی پێوەندی‌و پاشگری کەسی لە کوردیی خوارووودا » هەولی ئەوەی داوە پاشگرە کەسی‌یەکان بەپێی ئەرکیان دابەش‌بکات • ئێدمەندس لەم لێکۆڵینەوەیەدا گەیشتووەتە ئەو ئەنجامەی کە بەپێی ئەرك چوار جۆر پاشگری کەسیی لە زاری کوردیی خوارووودا دەست‌نیشان بکات • لەبەرئەوەی دابەش‌کردنەکەی پێوەندیی تەواوی بە باسەکەمەوە هەیە ، بۆیە لێرەدا وەکو خۆی وەری‌دەگرم‌و بەدوا ئەمەشدا چەند تێبینی‌یەك دەخەمە پێش‌چاو :

| ١ـ گیرەکی جێناو | ٢ـ گیرەکی کراو | ٣ـ گیرەکی کرداریلکاو | ٤ـ گیرەکی رانەبوردوو |
|---|---|---|---|
| م | م | م | م |
| ت | ت | ت | ت |
| ی | ـ | ێت | ێت/ئات |
| مان | ین | ین | ین |
| تان | ن | ن | ن |
| یان | ن | ن | ن |

تێبینی : ئـەو بزوێنە کورتـەی کە پێش (م)و (ت)و (ن) دەکـەوێت نیشان‌نەدراوە ، چونکە لەم‌جۆرە ڕێنووسەدا وێنەی بۆ دانەنراوە •

کاتێ ئێدمەندس دێتە سـەر دیاری‌کردنی ئەرکەکانی کۆمەڵی یەکەم ، دەڵێت : یەکێك لە ئەرکەکانی دەربڕینی خۆیەتی‌یە • تا ئەم شوێنە لاری لە ڕاکەیدا نی‌یە ، بەڵام نووسـەر لە لایەکی‌تری باسـەکەیدا کە دێتە سـەر دیاری‌کردنی ئەرکەکانی کۆمـەڵی دووەم ، دیسانەوە وا نیشـان‌دەدا ئەم کۆمەڵەش هەر دەتوانرێت بۆ دەربڕینی خۆیەتی بەکاربێت • لێرەدا لەگەڵیدا ڕێك‌ناکەوین‌و باوەڕمان وایـە کۆمەڵی دووەم هەرگیز ناتوانێ ئـەو ئەرکە جێ‌بەجێ بکات • بەداخەوە نووسەر بۆ پێ‌سەلماندنی ئەو ڕایەی نە بەڵگە نە نموونەی نی‌یە • بێ‌گومان ڕەخنە لەوە ناگیرێ کە ئێدمەندس هەر ئەوەندە لە خۆیەتی دواوە ، چونکە ئەو لە باسێکی‌تر دەدوێت ، هەروەك بە ناونیشانی لێکۆڵینەوەکەیدا دەردەکەوێت • ( لە بەشی چوارەمی ئەم‌باسەدا ئەو کۆمەڵە پاشگرانەی خۆیەتی دەردبڕن دیاری‌کراون ) •

مامۆستا (تۆفیق وەهبی)ش لە کتێبی «دەستووری زمانی کوردی»دا (جیزمی‌یەکەم) لە دوو شوێندا هاتۆتە سەر باسی خۆیەتی• یەکەم‌جار لە باسی

ئەرکەکانی جێناوی کەسی سەربەخۆدا (کە ئەو بۆناوی بەکارهێناوە)یەو دەڵێت : یەکێك لە ئەرکەکانی ئەم جۆرە جێناوانە ئەوەیە کە دەبێت بە تەواوکەری ناو ( بڕوانە : ل ٨٥ ، خاڵی ٥ ) • بۆ پێسەلماندنی ئەم ڕایەش فرێزی «ڕەنگەکەی ئەو»ی کردۆتە نموونە • بێگومان ئەم فرێزە خۆیەتی دەردەبڕێت ، کەچی مامۆستا وایدانەناوە • تەنانەت ئەو پاشگرانەش کە ئێمە لەمباسەدا بە پاشگری خۆیی ناویان دەبەین ، مامۆستا بە تەواوکەریان دادەنێت کە گوایا بۆ تەئکید بەکاردێنرێن • لە لاپەڕە ٩٨یشدا نووسەر کە لە فرێزی «مانگاکەم مرد» دەدوێ ، دەڵێ : (م)و (من) تەواوکەری «مانگاکە»ن و لە بەکارهێناندا جیاوازییان نییەو هەردووکیان دەوری تەئکید دەبینن • وەك دەردەکەوێت مامۆستا تۆفیق وەهبی تەنها ئەو فرێزانەی بە «هی» دەستپێدەکەن بە جێناوی خۆیەتی دادەنێت ، وەك : (هی من ، هی تۆ ، هی ئەوان ••• هتد) (ل ١١٣ ــ ١١٤) • بێگومان ئەم فرێزانە خۆیەتی دەردەبڕن، بەڵام تاکە ڕێگا نین بۆ گەیاندنی ئەو مەبەستە • ئەم ڕێگایە زۆر کەم بەکاردێت (بەتایبەتی لە نووسیندا)و لەبەرئەوەی کەرتی یەکەمی لەخۆیدا دیار نییە ، بۆ ڕوونکردنەوەی خۆیەتییەکە هەموو کاتێك لە پێشیەوە پێویستی بە ڕستەیتر هەیە (بۆ ڕوونکردنەوەی تەواوی ئەم کێشەیە ، بڕوانە : بەشی چوارەمی ئەم باسە ) •

مامۆستا نووری عەلی ئەمین (١٩٥٨) لە باسی ئیزافەدا (ل ٣٦) لەوجۆرە فرێزانە دواوە کە من دەڵێم خۆیەتی دەردەبڕن • وەك : پیاوەکەی نەریمان ، کوڕەکەی تۆ ••• هتد • بەڵام نووسەر خۆیەتیی بەکارنەهێناوە ، لەوەش دەچێت باوەڕیوا نەبێت ، هەرچەندە ئەو خەریکی لێکدانەوەی جۆری دارشتنەکانە نەك واتاکانیان • لە لاپەڕە (٧٧)دا کە دێتە سەر باسی ڕاناوی لکاو لەوە ناچێت خۆیەتیی لە خەیاڵدا بووبێت ، چونکە هەموو فرمانەکانی جێناوی لکاو دیاری دەکات ، بەڵام بە هیچ جۆرێك ئەوە دیاری ناکات ،

که ئەم جێناوانە بۆ دەربڕینی خۆیەتییش بەکاردێن • لە کتێبی «قەواعیـدی زمـانی کوردی » (١٩٥٦)یشدا نـاوی خۆیەتیی نەبردووە ، کەچی هەندێ لەو نموونانەی هێناوێتیەوە خۆیەتی دەردەبڕن ( بڕوانە : ل ٦٤) • لـەوە دەچێت مامۆستا نووری عەلی ئەمین یان باوەڕی بەوە نەبێت کە (ی)ی ئیزافەو ئەو جێناوانە خۆیەتی نیشان بدەنو ئەوەندە خەریکی لێکدانەوەی داڕشتن بووە کە واتای خستۆتە پشت گوێ • لەڕاستیدا باوەڕم وایە کە ڕای یەکەم ڕاست بێت ، چونکە کاتێ نووسەر دێتە سەر باسی جێناوی هەیی ( بڕوانە : ل ٦٧) ڕاستەوخۆ دەڵێت : « ضمیری ملکە »و لەجێی «هە ، هەمە ، هەتە•••» دەتوانرێت بەکاربینرێت• بەلای منەوە نووسەر لە دوو لاوە بەهەڵەدا چووە : یەکەم ــ کە دەڵێ جێناوی هەییش ئەمانەن (هی من ، هی تۆ ، هی ئەو•••)• لێرەدا تەنها (هی) یان (هین ــ لە قسەی هەندێ کەسدا) جێناوی هەیی‌یە نەك ( من ، ئەو ••• ) • ئەم ڕاستی‌یەش بەوەدا دەردەکەوێ کە ناویش لەم جێگەیەدا بەکاردێت ، وەك هی دراوسێکەمـان ، هی سـەگەکە ••• ) • دووەم ــ لەکوردیدا تەنهـا ( هی ) خۆیەتی دەرنابڕێت ، وەکو نووسـەر ڕای‌دەگەیەنێ ، بەڵکو هەندێ‌جار (ی)ی ئیزافەو وشەی لێکدراو بە بزوێنو جێناوی لکاوو کرداری (هە)ش هەمان ڕۆل دەبینن (بڕوانە : بەشی سێ‌یەمی ئەم باسە ) •

**- ٣ -**

## شێوەی جیاوازی
## دەربڕینی خۆیەتی لە زاری سلێمانیدا

١ــ بە بەکارهێنانی ناو یان جێناوی کەسی جیاو (ی)ی ئیزافە لەنێوان ناوو جێناوەکە یان دوو ناوەکەدا ، وەك : مەتەڵـەکەی ئـەو ، چـیاکانی

کوردستان ، باسەکەی خۆم ، چا شیرینەکانی ئافتاو [1] •

٢ــ بە لێکدانی دوو ناو بەهۆی مۆرفێمی (ە)وە ، وەك : کورە پاشا ، مەلاژن •••

وەك لەونموونانەدا دەردەکەوێ ، زۆر جار مۆرفێمی (ە)ی لێکدانەکە ، بەتایبەتی کە بەدوای بزوێنی (ێ ، ە ، ا ، ۆ)دا دێت لە شێوەدا دەرناکەوێت[2]• بەلای منەوە ئەم شێوەیە قۆناغێکی پێشکەوتووترە لە جۆری یەکەم • لەوانەیە هەموو فرێزێکی یەکەم کە زۆر بڵاوبووەوەو کەوتە سەر زار ، لە یەك بدرێنو ببنە شێوەی دووەم [3] • لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت لە یادمان

(١) مەرج نی‌یە هەر کاتێك دوو ناو بەدوای یەکتردا بێنو (ی)ی ئیزافە پێکیانەوە ببەستێ ، ئەو ڕۆنانە خۆیەتی دەربڕێت . لەڕاستیدا ئەم جۆرە ڕۆنانە پێوەندی واتاییی زۆر فراوان دەردەبڕنو بە خۆیەتی‌یەوە ناوەستن . بۆ نموونە کە دەڵێین : شەوی جاران ، شەوگاری پایز ، نوێژی شێوان ، لووتکەی ئێواران ... ئەوە لێرەدا پێوەندی خۆیەتی تەواو کاڵبۆتەوەو بەزەحمەت بەدی‌دەکرێت . فرێزەکان زیاتر کات دیاری‌دەکەنو بەشی دووەم لە هەموویاندا ئەرکی دیارخەر دەبینێت ( ڕەوشتی ئاوەڵناوی هەیە) . لە هەندێ نموونەی‌تردا (ی)ی ئیزافە وەکو ئەرکی ئامرازی پێوەندی ببینێ وایە وەك : زنجیری دەست، تەوقی مل ... هتد . لەم باسەدا تەنیا گوێمان داوەتە ئەو (ی)ی ئیزافەیەی بەتەواوی دیاردەی خۆیەتی دەردەبڕێت .

(٢) کە بزوێنی (ە)ی بەستن دێتە دوای بزوێنی‌ترەوە ، بەتایبەتی دوای بزوێنی درێژەوە ، خۆی نامێنێ ، وەك :

پیازی تەڕ = تەڕەپیاز
تەوقی سەر = تەوقەسەر
گلی سەر = گلەسەر

بەلام ژنی مەلا = مەلاژن (مەلا + ە + ژن) . هەندێ‌جار نەك هەر دەنگەکەی دوای خۆی دەگۆڕێت ، بەڵکو وشەکەش دەگۆڕێت ، وەکو :
ژنی مام = مامۆژن ( لە زاری سلێمانیدا ئامۆژن ) .

(٣) مەکارەس (لاپەڕە ٨٥) باوەڕی وایە کە لەمجۆرە ڕۆنانەدا وشەی یەکەم گرنگیی لە دووەم زیاترە . بۆ پێ‌سەلماندنی ئەم ڕایەی ئەم نموونەیەی خوارەوەی هێناوەتەوە :

نەچێت کە (مەلا ژن) هەر (ژنی مەلا) نی‌یە ، بەڵکو هەندێ‌جار مانای‌تریش دەردەبڕێت •

٣ــ بە بەکارهێنانی جێ‌ناوی (هی) لەگەڵ ناو یان جێ‌نـاوی کەسی جویدا ، وەك :

هی ئافتاو ، هی مـن ، هی ئەوان [٤] •

٤ــ بە بەکارهێنانی جێ‌ناوی کەسی لکاو • ئەم جێ‌ناوانە هەر ئەوانەن کە دەبن بە نیشانە بۆ بکەرو کراو • بۆ دەربڕینی خۆیەتی زۆرجـار ئـەم جێ‌ناوانە بەناوەوە یان بەدوای پاشگری‌ترەوە دەلکێنرێن • هەندێ‌جاریش جێ‌گۆڕکێ دەکەن (دواتر بەدرێژی دێینە سەر باسی ئەم دیاردەیە) [٥] •

---

مێردی پیر = پیرەمێرد .

بە لای منەوە شێوەی یەکەم (مێردی پیر) ئاسایی‌و بلاوترە ، بـەڵام شێوەی دووەم تەئکید لەسەر (پیری) دەکات . دیسانەوە مەکارەس لـەو باوەڕەدایە کە شێوەی یەکەم زیاتر لە زماندا ڕەگی داکوتاوە . لام وایـە ئەمە پێچەوانەی ڕاکەی من نی‌یە کە دەڵێم شێوەی دووەم قۆناغێـکی زیـاتری بڕیوە .

(٤) هەندێك ڕێزمان‌نووس ئـەم جۆرە ڕۆنانە لـەگەڵ جێ‌ناوی خۆیـەتیی ئینگلیزیدا بەراورد دەکەن‌و بە لەیەك‌چوویان دادەنێن ، بەڵام لەڕاستیـدا لە یەکترەوە دوورن ، ئەویش نەك هەر لەبەرئەوەی ئەم ڕۆنانە لە کوردیدا لە دوو وشە پێکهاتووە ، بەڵکو لەبەرئەوەشە کە کەرتی یەکەمی ڕۆنانەکە ( هی ... هین ... ) جێ‌ناوێکی بێ‌واتایە ، تەنیا ئەرکی ڕێزمانی هەیەو بۆ دوورکەوتنەوە لە وتنەوە بەکاردێت . بەپێچەوانەی ئەمەوە ، جێ‌ناوی خۆیەتی لە ئینگلیزیدا لە یەك وشەی پڕواتا پێك‌دێت ، واتـە هۆیەکی ڕێزمانی‌یە بۆ دوورکەوتنەوە لە دووپات‌کردنەوە .

(٥) جگە لـەم چوار ڕێگایە ، ڕێگەیەکی‌تریش هەیە بـۆ دەربڕینی خۆیـەتی بەهۆی بەکارهێنانی کرداری « هـە »وە یان بەهۆی چەند پاشـگرێکی دارشتنەوە ، وەك ( دار ، مەند ... ) ــ ( سەردار ، هۆشمەند ... ) . لێرەدا ئەم ڕێگایانەی‌تر خراونەتە پشت‌گوێ ، چونکە یەکەمیان بۆ دەربڕین پێویستی بە ڕستەیەکە ، دووەمیشیان دەوری کەمە ــ بـە واتایەکی‌تر تەنیا لەگەڵ ژمارەیەکی کەم‌وشەدا دێت کە ڕێزمان دیاری‌یان دەکات .

# جیاوازیی نێوان
# جۆرەکانی دەربڕینی خۆیەتی

ئاشکرایە کە ئەو چوار شێوە دەربڕینەی خۆیەتی لە ڕووی ڕۆنـانو بەکارهێنانو بلاوییانەوە وەکو یەك نینو هەریەکەیان تایبەتێتیی خۆیـان هەیە کە لە چەند خالێکدا ڕوونده‌کرێنەوە :

١ـ شێوەی یەکەم لە ڕووی ڕۆنانەوە بە فرێز دەژمێررێو لـە دوو وشە یان زیاتر دروست دەبێت • هەمیشە وشـەی یـەکەم سـەرەکییەو وشەکانیتر پیا هەلّدەدەن • بۆنموونە لە فرێزی «چیاکانی کوردستان»دا ، وشەی «کوردستان» دەوری ئاوەلّناو دەبینێت • «چیاکان» سەرەکییە ، چونکە دەتوانێت جێی هەموو فرێزەکە بگرێتەوە • بەمجـۆرە لە فرێـزی «باسەکەی خۆم»دا ، وشەی «باسەکە»و لە فرێزی «چا شیرینەکانی ئافتاو»دا، وشەی «چا» سەرەکین •

لە ڕووی واتاوە شێوەی یەکەم پڕە • هەموو پارچەکانی فرێزەکان (نویٚ)ن • لەبەرئەوەی بۆ یەکەمجار دەدرێن بە گوێی گوێـگردا ، هیـچ شتێـکیان لیٚ نەقرتاوە • هۆی ئەمەشە ئەگەر بێتو لە چوارچێوەی قسەشدا نەبێت ، هەر واتا دەدەن • لەبەر ئەم پڕیی واتایە ئەو جۆرە فرێزانـە لـە سەرەتای قسەدا بەکاردێنو بەرە بەرە کە شت ڕوون بووەوەو گلۆلـەی باسەکە دەرکەوت ، بەکارهێنانی ئەو جۆرە فرێزانە کەمدەبێتەوەو شێوەکانیتر (بەتایبەتی شێوەی سێیەمو چوارەم) زۆرتر بەکاردێن •

٢ـ جۆری دووەم لە ڕووی ڕۆنانەوە وشەیەکی لێکدراوە • پارچەیەکی سەرەکییەو پارچەکەیتری دیاریکەرە • مەرج نییە پارچە سەرەکییەکە

لەپێشەوە بێت (وەك لە جۆری یەکەمدا) • هەندێجار پارچە سەرەکی‌یەکە دەکەوێتە دواوە • بە وێنە لە «ژنبرا»دا «ژن» سەرەکی‌یە ، بەلام لە «مەلاژن»دا «ژن» کە کەوتۆتە دواوە سەرەکی‌یە •

لە ڕووی واتاوە ئەم جۆرەش ، وەك جۆری یەکەم پڕەو موڵكو خاوەن موڵك دەردەبڕێت • هەردوو پارچەکە بۆ یەکەمجار دەدرێن بەگوێی گوێگرداو بۆیە هیچیان لێ ناقرتێ • ئەوەی لەم شێوەیەدا سەرنج ڕادەکێشێ، ئەوەیە کە پێوەندی خۆیەتی کراوە بەژێرەوە • لە ڕووی واتاوە ڕاستەوخۆ دیار نی‌یە ، بەلام دوای لێكدانەوەو بەراورد لەگەڵ جۆری یەکەمدا ، پێوەندی خۆیەتی دەردەکەوێ • بۆنموونە :

مەلا ژن = ژنی مەلا
کوڕە پاشا = کوڕی پاشا
براژن = ژنی برا
وەستاژن = ژنی وەستا

لە دوو ڕووەوە ئەم چەشنە فرێزانە لە فرێزی خۆیەتیی جیادەکرێنەوە :

١ ــ زۆرجار ئەم وشە لێکدراوانە مانایەکی تایبەتیی چەسپاو Idiomatic ی خۆیان هەیە • جگە لە پێوەندی خۆیەتی ، وەك لەسەرەوە وتمان «کراوە بەژێرەوە» ، هەروەها مانای تەوسو ناڕەزاییو گاڵتەش دەردەبڕێت •

٢ ــ لەبەرئەوەی ئەم وشە لێکدراوانە لە ڕێزماندا بە یەك دانە دادەنرێن ، بۆیە کاتێك پاشگری (ەکە)ی ناسیاویی بۆ زیاد دەکەین ، هەموو وشەکە (واتە هەردوو پارچەکە) دەناسرێ • بەپێچەوانەشەوە کە پاشگری (ەکە) بۆ فرێزی خۆیەتی زیاد بکەین ، تەنها پارچەی دواوە دیاری دەکات •
بۆنموونە :

کوڕە پاشا > کوڕە پاشاکە ( وشەکە دیاری کراوە ) •

کوڕی پاشا > کوڕی پاشاکە (تەنها «پاشا» دیاری کراوە ) •

٣ ــ لە ڕۆناندا جۆری سێیەم دیسانەوە بە فرێز دەژمێررێ ، بەلام هیچ پارچەیەکی سەرەکی نی‌یە ، چونکە ناتوانێت جێی هەموو فرێزەکە بگرێتەوە •

لە ڕووی واتاوە وەکو چەشنی یەکەم و دووەم پڕ نی‌یە ، چونکە جگە لەوەی کە جێناوەکەش (بێ ئەوەی بزانین بۆ کێ دەگەڕێتەوە) بەتەنیا واتای تەواو نادات ، هەروەها خۆیەتی‌یەکەش نەدراوە • مانای جۆری سێیەم تەنها لە چوارچێوەی قسەکردندا دەردەکەوێ و بەتەواوی بە ڕستەی پێش خۆیەوە بەندە • لەبەرئەوە لە قسەکردندا بۆ دووبارە نەکردنەوەی قسە بەکاردێت • لە نووسیندا بەکارهێنانی زۆر کەمە •

٤ ــ جۆری چوارەم لە ڕووی ڕۆنانەوە وشەیەکی ئاڵۆزە ( لە مۆرفێمێکی ئازاد و مۆرفێمێك یان چەند مۆرفێمێکی بەند پێکهاتووە) • لە ڕووی واتاوە لە چەشنی یەکەم و دووەم واتا کەمتر دەدرکێنێ (چونکە پاشگرەکە تەواو دیاری ناکات مولکەکە هیی کێیە هەرچەندە دەزانین کەسی چەندەمە)، بەلام لە جۆری سێیەم پڕترە• لەبەر کورتی لە هەموو جۆرەکانی‌تر زۆرتر بەکاردێت •

لەم باسەدا تەنها چەند تێبینی‌یەکم هەیە کە دەمەوێ لەبارەی جۆری چوارەمەوە بیخەمەڕوو • پاشماوەی ئەم باسە تەنها پێوەندی بەو خۆیەتی‌یەوە هەیە کە بە شێوەی چوارەم دەردەبڕێت • ( هیوادارم بتوانم لە نووسینێکی‌تردا لەسەر جۆرەکانی‌تر بەدرێژی بنووسم ) •

— ٥ —

# جۆرەکانی پاشگرو پاشگری خۆیەتی

هەرچەندە لە بەشی یەکەمی ئەم باسەدا وتمان ئەو جێناوە لکاوانەی خۆیەتی دەردەبڕن ، لە شێوەدا هەر ئەوانەن کە دەبنە نیشانەی بکەرو کراو، بەڵام لەڕاستیدا بە تەواوی وا نی‌یەو بە لای‌کەمەوە دەتوانین دوو جـۆری جیاواز لەم‌پاشـگرانە دیاری بکەین : ١ــ کۆمەڵێك کە بۆ خۆیەتی بەکاردێت ؛ ٢ــ کۆمەڵێك بۆ نیشانەی بکەرو کراو ٠ (٦)

| کۆمەڵی یەکەم | | کۆمەڵی دووەم |
|---|---|---|
| کەسی یەکەم | تاك (م) | م |
| | کۆ (مان) | یین / |
| کەسی دووەم | تاك ت | ت |
| | کۆ تان | ن / |
| کەسی سێیەم | تاك ی | ێ ، ێت ، ئا ، ئات |
| | کۆ یان | ن / |

(٦) لێرەدا دەبێت ئەو ڕاستی‌یە بخەینە ڕوو کە پاشگری (م) و (ت) یەکسەر بە وشـەیەکەوە نالکێن کە بە نەبزوێن کۆتایی هاتبێت ، بەڵکو پێویستیان بە بزوێنێکی کورتە ، کە ئەم ڕێنووسەمان دەری‌ناخات . مەکارەس لەو ڕایەدایە کە ئەم پاشگرانە لە دروست‌بووندا « نارێکن » ، بەڵام لە ڕاستیدا وا نی‌یە ، چونکە وەرگرتنی (م) لە (من)ەوە ، (ت) لە (تۆ)وە ئاسایی‌یە . لەکۆشدا تەنیا (ئـان)ی کۆیان وەرگرتووەو بوون بـە ( مان )و (تان) . نارێکی‌یەکە تەنیا لە کەسی سێیەمدا دیارە ، چونکە نازانین (ی) لە چی‌یەوە هاتووە ، بەڵام دیسان لەکۆدا ڕاست‌بووەتەوەو بەهۆی نیشـانەی کۆوە بووە بە (یان) . لە کۆمەڵی دووەمدا پاشگری کەسی سێی تاك زۆر نارێکە، لە کەسی یەکەم‌و دووەم‌و سێیەمی کۆدا ، وەك نیشانەیەکی کۆ تەنیا (ن) ماوەتەوە .

کۆمەڵی یەکەم چەند تایبەتی‌یەکی هەیە :

١ــ تەنها ئەم کۆمەڵە بۆ دەربڕینی خۆیەتی بەکاردێت : خانوەکەم ، خانوەکەت ، خانوەکەمان ، خانوەکەتان ، خانوەکەی ، خانوەکەیان ••• پاشگری ن = ئێوە / ئەوان ، هەروەها پاشگری یین = ئێمە هەرگیز خۆیەتی دەرنابڕن‌و نالکێن بە ناوەوە •

٢ــ ئەم کۆمەڵە پاشگرە لەگەڵ کرداری ڕابوردووی تێپەڕدا دەبن بە نیشانەی بکەر : خواردم ، خواردت ، خواردمان ، خواردتان ، خواردیان •••

٣ــ ئەگەر تافی کردار ڕانەبووردوو بێت ، دەبنە نیشانەی کراو :

| دەتانشکێنم | دەیخۆم |
|---|---|
| (کراو) (بکەر) | ( کراو ) ( بکەر ) |
| دەتکوژم | دەمانخۆی |
| (کراو) (بکەر) | (کراو) (بکەر) |

لەبەرئەوەی ئەم کۆمەڵە ئەرکی سەرەکی‌یان دەربڕینی خۆیەتی‌یەو زۆر کات بە ناوەوە دەلکێن ، هەندێ لە زمانەوانان بە «پاشگری جێ‌ناو»ی ناودەبەن • ئەم ناونانە بەلای منەوە زۆر ڕاست نی‌یە چونکە بێجگە لە خۆیەتی ، ئەرکی‌تریان هەیە ، وەك لە خاڵی (٢)و (٣)ی سەرەوەدا دەردەکەوێت • هەروەها هەندێ‌جار هەر بۆ دەربڕینی خۆیەتی بە کردارەوە دەلکێن (لە بەشی حەوتەمدا بەدرێژی ئەمە ڕووندەکەینەوە ) •

لەبارەی کۆمەڵی دووەمەوە پێویستە ئەم تێبینی‌یانە بخرێنە ڕوو :

١ ــ لەگەڵ کرداری ڕانەبوردووو کرداری ڕابوردووی تێنەپەڕدا دەبنە نیشانەی بکەر ، وەك :

دەخۆم ، دەخۆیت ، دەخوات ، دەخۆن ، دەخۆین

ڕۆیشتم ، ڕۆیشتیت ، ڕۆیشتن ، ڕۆیشتین •

٢ ــ لەگەڵ کرداری ڕابوردووی تێپەڕدا دەبنە نیشانەی کراو • وەك:

شکاندمن — خواردیانین

(بکەر) (کراو) — (بکەر) (کراو)

٣ ــ لە کەسی سێیەمدا وەك لە نەخشەکەی سەرەوەدا دەردەکەوێت پاشگرەکە شێوەی زۆرە :

ڕۆیشت (مۆرفێمی زیادنەکردووە) •

دەخوا ، دەخوات (ئا / ئات زیاددەکات ) ، لەبەرئەوەی ڕەگی کردارەکە بە (و) دوایی دێت •

دەمرێ ، دەمرێت (ێ / ێت زیاد دەکات ) •

دیسان هەندێ زمانەوان بەم کۆمەڵی دووەمە دەڵێن «پاشگری کرداری» • ئەم ناوە لەجێی خۆیا نییە ، چونکە ئەندامانی ئەم کۆمەڵە هەرگیز بۆ خۆیەتی بەکارنایەنو لەبەرئەوە ناڵکێن بە ناوەوە •

لەم باسەدا کە لەسەر خۆیەتییە بەهۆی جێناوی لکاوەوە پێوەندی ڕاستەوخۆمان بە کۆمەڵی یەکەمەوە هەیەو لەمەودوا بۆ ئاسانیو سەرتێك نەدان بەم کۆمەڵە دەڵێین « پاشگری خۆیەتی » •

– ٦ –

## دابەش کردنی زمانەکانی جیهان
## بەپێی ڕەوشتی مۆرفێمو شوێنی زمانی کوردی

بەپێی ڕەوشتی مۆرفێمەکان ، زمانەکانی جیهان بەسەر چەند کۆمەڵێکدا دابەش دەبن :

یەکەم ــ ئەو زمانانەی لە مۆرفێمی جیا جیا پێك‌دێن‌و هەر مۆرفێمە واتایەك یان ئەرکێکی ڕێزمانی دەبینێ• بۆ کۆ ، کەس، خۆیەتی ، پرسیار••• مۆرفێمی سەربەخۆیان هەیە • باشترین نموونە لەم جۆرە زمانە ، زمانی (چینی)یە • ئینگلیزییش تاڕادەیەك لەم کۆمەڵەیە ، بەڵام بەتەواوی نا •

دووەم ــ ئەو زمانانەی ژمارەیەکی زۆر پاشگرو پێشگر بەکاردێنن بۆ ئەرکە ڕێزمانی‌یەکان ، وەکو کەس‌و خۆیەتی ، تاك‌و کۆ ••• تاد ، بەجۆرێك کە پاش‌و پێش‌خستنی وشە هیچ ڕۆڵێك نابینیت • باشترین نموونەی ئەم کۆمەڵە ، زمانی لاتینیی کۆنە •

سێیەم ــ ئەو زمانانەی مۆرفێمەکانیان بە بەند یان ئازاد بەدوا یەکتردا دێن ، بێ‌ئەوەی گۆڕانیان بەسەردا بێت • بە واتایەکی‌تر هەموو مۆرفێمەکان ڕۆنانی دەنگیی خۆیان دەپارێزن‌و دەنگیان لێ‌ناقرتێ‌و زیادناکەن • زمانی تورکی باشترین نموونەی ئەم کۆمەڵەیە کە پێی دەڵێن Polysynthetic •

چوارەم ــ ئەو زمانانەی ڕستەی ئاسایی‌یان نی‌یەو لە شوێنی ڕستەدا وشەی گەورەکراو بەکاردێنن ( Agglutinatve ) • لەم جۆرە زمانانەدا مۆرفێمی بەندو ئازاد بەیەکترەوە دەئاڵێن تا واتای ڕستە دەدەن بەدەستەوە • زمانی ئەسکیمۆ باشترین نموونەی ئەم دەستەیەیە (٧) •

ئایا زمانی کوردی بەپێی ڕەوشتی مۆرفێمەکانی لە کام‌جۆرە ؟ لەڕاستیدا زمانی کوردی ، وەك زۆر زمانی‌تر لە ڕیزکردنی مۆرفێمەکانیدا ڕێگەیەکی

---

(٧) بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ زمانەوانە ڕۆژئاوایی‌یەکان دەیانویست بەم‌پێ‌یە زمانەکانی جیهان دابەش‌بکەن ، بەڵام دوایی بۆیان‌دەرکەوت ، کە دابەش‌کردنی‌وا بێ‌سوودو مەحاڵە ، چونکە زۆربەی زمانەکان بەتەواوی ناچنەوە سەر جۆرێك لەم چوارە ، لەبەرئەوە تەنیا لە لێکۆڵینەوەی جۆرەکانی مۆرفێمدا بەکاردێت ، نەك جۆرەکانی زمان . منیش لێرەدا هەروا بەکارم‌هێناوە •

تایبەتی ناگرێت،لەبەر ئەوە ناتوانین لە ڕیزی یەکێك لەو کۆمەڵانەی سەرەوەی دابنێین • بۆ دیاری کردنی شوێنی زمانی کوردی پێویستە هەندێ تێبینی بخەینە ڕوو :

١ــ زمانی کوردی ناچێتە کۆمەڵی سێیەمەوە ، چونکە کە مۆرفێمەکانی دەچنە سەر یەك ، هەموو کاتێك سەربەخۆیی خۆیان ناپارێزن • هەندێ جار دەنگ ونده‌کەن ، هەندێ جار دەنگی زیاد دێتە ناوەوە ، هەندێ جاریش لە لێکدانی دوو دەنگ ، دەنگێکی جیاواز دێتە کایەوە ، بۆ نموونە :

**دەنگ زیاد بوون**

بیدروو + ەوە > بیدروورەوە

بیلێ + ەوە > بیلێرەوە

بیخۆ + ەوە > بیخۆرەوە

**دەنگ ونکردن**

منداڵ + ەکە + ان > منداڵەکان

بخۆ + ە > بخۆ

**دەنگی جیاواز**

خانوو + ەکە > خانۆکە

قاپی + ەکە > قاپێکە

٢ــ لە کوردیدا هەرچەندە کەس و تاك و خۆیەتی شێوەی مۆرفێمی بەند وەردەگرن ، بەڵام ناگەڕێنەوە بۆ کۆمەڵی چوارەم ، چونکە ئاوەڵناوو پارتیکل[٨] هەرگیز نابن بە مۆرفێمی بەندو بەناویەکدا ناچن •

(٨) پارتیکلز داهێنانێکی قوتابخانەی داڕشتنە لە ڕێزماندا . پێشڕەوەکانی ئەم قوتابخانەیە نارەزاییەکی توندیان بەرامبەر قوتابخانەی ڕێزمانی

٣ــ كوردی له كۆمه‌ڵی یه‌كه‌م به‌وه جیا ده‌كرێته‌وه كه بــۆ ده‌ربڕینی ئه‌ركه ڕێزمانی‌یه‌كان وه‌كو كه‌س / تاك ، كۆ•• مۆرفێمی ئازاد به‌كارناهێنێت• له هه‌مان‌كاتدا كوردی له‌م كۆمه‌ڵه ده‌چێت ، چونكه گۆڕینی شوێنی وشه واتا ده‌گۆڕێت • بۆنموونه :

« پیاوه‌كه سه‌گه‌كه‌ی هه‌ڵبری

جیــاوازه له :

« سه‌گه‌كه پیاوه‌كه‌ی هه‌ڵبڕی » •

٤ــ تا ڕاده‌یه‌كی زۆر كوردی له كۆمه‌ڵی دووه‌م ده‌چێت ، چونكه بۆ ده‌ربڕینی ئه‌ركه ڕێزمانی‌یه‌كانی پشتێكی ته‌واو به پاشــگر ده‌به‌ستێ • لــه هه‌مان‌كاتدا به ته‌واوییش له‌م كۆمه‌ڵه نی‌یه ، چونكه گۆڕینی شوێنی وشه‌كان، وه‌ك له به‌ندی (٣)دا باسمان‌كرد ، ڕۆڵی تایبه‌تیی هه‌یه له واتادا •

به‌پێی ئه‌و به‌راورده‌ی سه‌ره‌وه ، ده‌رده‌كه‌وێت كه ڕه‌وشتی مۆرفێمه‌كانی كوردی تاڕاده‌یه‌ك له ره‌وشتی مۆرفێمه‌كانی كۆمه‌ڵی یه‌كه‌م‌و دووه‌م ده‌چێت، به‌ڵام به‌ته‌واوی ناچێته‌وه سه‌ر هیچیان • به واتایه‌كی‌تر كوردی پاشگر زۆر به‌كاردێنێ‌و پاشگره‌كان ده‌توانن به‌یه‌كه‌وه بلكێن تا ژماره‌یان ده‌گاته چوار ، به‌ڵام لــه هه‌مان‌كاتدا به‌ره‌ڵلایی تــه‌واو نی‌یه له ڕیزكردنی وشــه‌دا بــۆ دروست‌كردنی ڕسته •

---

كلاسیكی هه‌بوو ، گوایا ئــه‌مانه گرنگیی زۆریان به واتــا داوه‌و هه‌موو كاره‌كانیان له‌سه‌ر ئه‌م بنچینه‌یه بنیادناوه . ئه‌وه‌بوو لــه دابه‌ش‌كردنی به‌شه‌كانی ئاخاوتندا ناوو ئاوه‌ڵناوو جێ‌ناوو كرداریان جیاكرده‌وه‌و بــه به‌شی سه‌ره‌كی‌یان دانان . هه‌موو به‌شه‌كانی‌تریشیان ناونا « پارتیكلز ». له‌دوایدا ئه‌میشیان به‌سه‌ر ئامرازو ئاوه‌ڵكرداردا دابه‌ش‌كرد . له ڕاستیدا پارتیكلز وه‌ك هه‌گبه‌یه‌كی لێ هات، هه‌رچی‌یه‌ك نه‌كولایه تێیان ده‌هاویشت، وه‌ك ئاوه‌ڵكرداری كلاسیكیكانی لێ‌هات . لــه كوردیدا پارتیكلز ئه‌مانــه ده‌گرێته‌وه : ئامرازی پێوه‌ندی ، ئامرازی به‌ســتن ، لێكده‌ری (كــه) ، ئامرازی پرسیار ، ئاوه‌ڵكردار ، ژماره .

# ڕیزبوونی پاشگرەکان‌و شوێنی پاشگری خۆیەتی لە ڕستەی کورتکراوەدا

دوای ئەوەی بەپێی ڕەوشتی مۆرفیمەکان شـوێنی زمانی کوردیمان لەنێوان زمانەکانی جیهاندا دیاری‌کردو سەلماندمان کە کوردی تاڕادەیەك پشت بە پاشگر دەبەستێ بۆ دەربڕینی ئەرکە ڕێزمانی‌یەکان‌و دەرمان‌خست کە ئەو پاشگرانە توانای ئەوەیان هەیە تا ژمارەیەکی دیاری‌کراو بەدوای یەکتردا بێن‌و لەم بەدوای یەکترا هاتنەدا زۆر جار ڕۆنانی دەنگی‌یان دەگۆڕێت ، ئنجا دێینە سەر باسی پێوەندی پاشگری خۆیەتی لەگەڵ پاشگرەکانی‌تردا لە سنووری وشـەدا •

لەبەرئەوەی کوردی نـاوگرو پێشگر کەمتر لە پاشـگر بەکاردێنێ ، کاتێك ژمارەیەك پاشگر لە سنووری وشەدا بەدوای یەکتردا هاتن ئەوە دەبێت ڕیزبکرێن‌و ئەم ڕیزکردنەش لەخۆوە نابێت • هەرچەندە هەرجارەی بەجۆرێکە بەلاّم بەپێی یاسایەکی تایبەتی‌یە • کوردی ڕێگەی ئەوە دەدات دیاری‌کردن‌و تاك/کۆو خۆیەتی‌و بکەر بەشێوەی پاشگر دەربڕرێت لە یەك وشـەدا ( کە دەبێتە وشەیەکی ئاڵۆز ) • یاسایەکی نەگۆڕاویش پێوەندی ئـەم دیاردانە ڕێك‌دەخات • بەوێنە دەبێت دیاری‌کردن لـەپێش هەموویانەوە دەربڕرێت ئنجا ژمارە ، بەدوایاندا خۆیەتی‌و لەدوای هەموویانەوە بکەر •

ئەو ڕیزبوونەی سەرەوە هەمیشەیی‌یەو ناگۆڕێت• بێ‌گومان مەرج نی‌یە لە وشەیەکدا هـەر چوار دیاردەکە هەبێت ، بەلاّم ئەگەر تـەنیا خۆیەتی‌و دیاری‌کردن هـەبێت دیاری‌کردن پێش‌بخرێت‌و خۆیەتی لەدواوە دابنرێت • دەتوانین بەوێنەخشەیەی خوارەوە ئەم ڕیزکردنە پتر ڕوون بکەینەوە :

پاشگری

| وشه | + | دیاری‌کردن | + | کۆ/تاك | + | خۆیەتی | + | بکەر |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|

لێرەدا پێویستە ڕوونی بکەینەوە ، کە مەبەست لە پاشگری دیاری‌کردن تەنها (ەکە)و ئەلۆمۆرفەکانی نی‌یە ، بەڵکو (ە)ی پاشبەندی ئاوەڵناوی ئیشارەت‌کردنیش دەگرێتەوە • لەونموونانەی خوارەوەدا ئەو مۆرفێمانەی هێڵیان بەژێردا هاتووە ، لەم‌باسەدا هەموویان بە پاشگری دیاری‌کردن دانراون :

ئەو پیاوە — پیاوە**کە** / پیاوە**کان**

ئەم کوڕە — خانوو**کە**

هەروەها پاشگری کۆو تاك • نەك هەر (ێك)و ئەلۆمۆرفەکانی‌و (ئان)و ئەلۆمۆرفەکانی، بەڵکو پاشگرە نائاسایی‌یەکانی ، وەك (ــ هات/ ــ ئات، ــ گەل )یش دەگرێتەوە • ئـەم نموونانەی خوارەوە ڕیزبوونی پاشگرەکان ڕووندەکاتەوە :

١ــ منداڵەکانتم ڕەوانە کرد

منداڵ + ەکە + ئان + ت + م

دیاری‌کردن + کۆ + خۆیەتی + بکەر — ٤ پاشگر

٢ــ پارەکەتیان دۆڕاند

پارە + ەکە + ت + یان

دیاری‌کردن + خۆیەتی + بکەر — ٣ پاشگر

٣ــ پاندانێکتم بەخشی تا خۆت هاتیتەوە

پاندان + ێك + ت + م

تاك + خۆیەتی + بکەر — ٣ پاشگر

٤ــ منداڵەکانمم بە زۆر ناردەوە

منداڵ + ەکە + ان + م + م

دیاری کردن + کۆ + خۆیەتی + بکەر ٤ پاشگر

٥ــ لاوەکانمان نموونەن

لاو + ەکە + ئان + مان

دیاری کردن + کۆ + خۆیەتی ٣ پاشگر

بێ گومان هەندێ لــە یەکدان ڕێــگەی نادرێ • چەنــد نموونەیەکی ناپەسەند لە زاری سلیمانیدا :

* ئەم ژنەکە

ژن + ە + ەکە

( لە کوردیدا ناوێك دوو جار دیاری ناکرێت ) •

* ئەسپانم کڕی

ئەسپ + ان + م

کۆ + بکەر

( لە زاری سلێمانیدا هەندێ ناو پێش کردنی بــە کۆ ، دەبێت دیاری بکرێت ، واتە ــ ەکە ــ ی بخرێتە سەر • دواتر بە درێژی لەمە دەدوێین ) •

* دەستەکەمم بڕی

دەست + ەکە + م + م

دیاری کردن + خۆیەتی + بکەر

( دیسانەوە لە زاری سلێمانیدا هەندێ ناو دەبێ بێ دیاری کردن پاشگری خۆیەتی وەرگرێت • دواتر ئەم کێشەیە ڕوون دەکەینەوە ) •

## ناوو ڕێکەوتنی لەگەڵ پاشگری خۆیەتیدا

هەندێ ناو دەبێت پاشگری خۆیەتیی یەکسەر بەدوادا بێت ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| دەست | دەستم | ❋ دەستەکەم |
| قاچ | قاچم | ❋ قاچەکەت |
| پێ | پێم | ❋ پێیەکەم |
| سنگ | سنگم | ❋ سنگەکەم[٩] |
| شان | شانت | ❋ شانەکەم |
| دان | دانم | ❋ دانەکەم |

هەندێ ناوی تر بەپێچەوانەوە تاوەکو بەهۆی پاشگری (ەکە) یان (ە)وە دیاری نەکرێن پاشگری خۆیەتی وەرناگرن ، وەك :

| | | |
|---|---|---|
| ئەسپ | ئەسپەکەم | ❋ ئەسپم |
| پاندان | پاندانەکەم | ❋ پاندانم |
| شەرواڵ | شەرواڵەکەم | ❋ شەرواڵم |
| خانوو | خانوکەم | ❋ خانووم |
| پەنجەرە | پەنجەرەکەمان | ❋ پەنجەرەمان |
| پیاڵە | پیاڵەکەت | ❋ پیاڵەت |

کۆمەڵێ ناو هەن بە هەردوو شێوە دەبینرێن ـ واتە بێ دیاریکردن لەگەڵ پاشگری خۆیەتیداو بە دیاریکردن لەگەڵ هەمان پاشگردا ، وەك :

---

(٩) تەنیا کاتێك بۆ پارچەی لەش بەکارمان نەهێنابن ، ئەم وشانە دەتوانن پاشگری خۆیەتی بەدوای پاشگری ناسیندا وەرگرن .

| | |
|---|---|
| مالم | ماڵەکەم |
| یارم | یارەکەم |
| کوڕم | کوڕەکەم |
| خوشکم | خوشکەکەم |
| باوکم | باوکەکەم |

کەواتە بەپێی ڕێکەوتن لەگەڵ پاشگری خۆیەتیدا ناو لە زمانی کوردیدا دەتوانرێت بکرێت بە سێ بەشەوە :

١ـ کۆمەڵی یەکەم ـ ئەو ناوانەن کە یەکسەر دەتوانن پاشگری خۆیەتی وەرگرن • ئەمانە بریتین لە ناوی ئەندامەکانی لەش (قاچ ، دەست ، سنگ ، دان ، سەر ، قژ ، قاچ ، قۆڵ ، پێ ، چاو ، لووت ••تاد )و ئەو ناوانەی پێوەندیی خزمایەتی یان ناسیاوی نیشان دەدەن (باوك ، برا ، خوشك، دایك ، مام ، خاڵ ، ئامۆزا ، ژنبرا ، براژن ، هاوڕێ •••هتد )و هەندێ ناویتر وەك (ماڵ، یار ، گوڵ •••) •

٢ـ کۆمەڵی دووەم ـ ئەو ناوانەن کە یەکسەر ناتوانن پاشگری خۆیەتی وەرگرن • پێش ئەوەی بکرێنە خۆ پێویستیان بە پاشگری دیاریکردنە • ئەم کۆمەڵە بە ژمارە زۆر زۆرترن لە کۆمەڵی یەکەم • وەك ( پارە ، دار ، کراس، دێ ، شار ، دۆشەك ، دەرگا ••• تاد ) •

٣ـ کۆمەڵی سێیەم ـ ئەو ناوانەن کە دەتوانن لە هەردوو بارەکەدا بەکاربێن ، جارێك ڕاستەوخۆ لەگەڵ پاشگری خۆیەتیدا ، جارێکیتر لەدوای ناسین پاشگری خۆیەتی وەردەگرن • وەك : ماڵ ، باوك ، دایك ••• تاد • ژمارەی ئەم ناوانەش کەمن :

ماڵت وێران بێت

ماڵیان دوورە

سەرومـــاڵی تیاچوو
ماڵــەکەمی
کچەکەی نەداوە بە شوو
کچەکە لە چیدایت ؟
کچم وا نابێت
دایکم لە ماڵەوەیە
دایکەکەم بۆ وا دەکەیت ؟
بـــاوکم نەمـــاوە
باوکەکەم خەریکی چیت ؟

بۆ لێکدانەوەی ئەم دیاردەیە ، دەتوانین چەند ڕێگایــەك بــگرین ، لەدوای بەراوردکردن کامیان ڕاستیەکەی تەواو دەرخســت پەسەنــدی دەکەین :

١ــ هۆی فۆنەتیکی : ئایا دەتوانین بڵێین ئەم دیاردەیە هۆی فۆنەتیکیی هەیە ؟ بۆ وەرامی ئەم پرسیارە دەبێت لە شوێنی پاشـــگرەکان بکۆڵینەوەو باش لێیان وردبینەوەو بزانــین ئایــا پاشگری خۆیەتی شــوێنی تایبەتی دەگرێتو ، بەدوای چەند دەنگێکدا دێتو لەگەڵ دەنگیتردا ڕێك دەکەوێت• ئاشکرایە ، لەو نموونانەی سەرەوەدا فۆنەتیك دەور لەم کێشەیەدا نابینێت ، چونکە هەمان وشــەی ( ماڵ ، کچ ، دایك ••• تاد ) لــە هەردوو بارەکەدا دەبینرێت•بە واتایەکیتر هەر ئەو دەنگانەی ــ ڵ ــ، ــ چ ــ، ــ ك ــ جارێك ڕاستەوخۆ پاشگری خۆیەتی وەردەگرنو جارێك لەپێشدا پاشگری ناسینو ئنجا پاشگری خۆیەتیی وەردەگرن • کەواتە فۆنەتیك کەمو زۆر کێشەکەمان بۆ چار ناکات •

٢ــ هۆی ڕێزمانی : ئەمەشیان هــەر نامانگەیەنێتە ئەنجام ، چونکە

هەموو وشەکان خۆیەتی ڕاستەوخۆ وەرگرن یان نا ، هەر یەك ئەرکی ڕێزمانی دەبینن ئەویش ( ناو )ە • دیســـان ئەگەر لە جۆرەکانی ناویش بکۆڵینەوە ، دەبینین کە زۆربەیان ناوی بەرجەستەن •

٣ـ هۆی واتایی : کە لـــە واتای وشـــەکان ورددەبینەوەو واتـــای ڕستەکانیش لێكدەدەینەوە ، بـــۆ چارەسەرکردنی کێشـــەکە دوو ڕێگامان دەستگیر دەبێت :

ا ــ جیاوازیی نێوان کۆمەڵی یەکەم‌و دووەم لەوانەیە لەکوردیدا بە شێوەیەکی گشتی بگەڕێتەوە بۆ چمکی فکرەی ژمارە • کاتێك ژمارەیەکی بێ‌سنوورمان لە شتێك هەبێت ، دەبێت یەکێکیان لێ هەڵبژێرین ، بیناسێنین‌و ئەوسا خاوەنەکەی دیاری‌بکەین • بەپێچەوانەشەوە ، ئەو ناوانەی خۆیان تا ڕادەیەك ژمارەیان کەمە پێویست ناکات بیان‌ناسێنین ، بەڵکو یەکسەر دەتوانین پاشگری خۆیەتی بە دوایانەوە بلکێنین • ئـــەم بۆچوونە تاڕادەیەك چاری کێشەکەمان دەکات • کۆمەڵی یەکەم ، وەك ( سنگ ، قاچ ••• ) تاڕادەیەك ژمارەیان دیاری‌کراوە ، لەبەرئەوە ڕاستەوخۆ پاشگری خۆیەتی وەردەگرن •

بەم‌پێ‌یە دەوترێ :

سنگم دەیەشێت

قاچم بریندارە

( ئەمانە ڕستەی پەسەندن ) •

بەڵام ڕستەکانی :

قاچەکت بریندارە

سنگەکەی دەیەشێت

( پەسەند نین ) •

هەروەها ئەم بۆچوونە چاری کۆمەڵی دووەمیش : ( خانوو ، دار ••• )

دەکات • ئەمانە لە سروشتندا ژمارەیان زۆرە ، لەبەرئەوە پێویستیان بەوەیە بناسرێن‌و ئنجا خاوەنیان بۆ دابنرێت •

بەم‌جۆرە :

شەرواڵەکەمم شت
خانۆکەیان ڕووخاوە
( لە ڕووی ڕێزمان‌و واتاوە ڕستەی پەسەندن ) •

بەڵام ڕستەکانی :

شەرواڵمم شت
خانوویان ڕووخاوە
( کە لە زاری سلێمانیدا دەبینرێن ، ناپەسەندن ) •

ناتەواویی بۆچوونەکەمان کاتێك دەردەکەوێ کە دێینە سەر کۆمەڵی سێیەم • وشەی ( دایك )یان ( باوك ) ژمارەیان زۆر نی‌یەو بگرە بە زۆری هەر بۆ تاکە کەسێ بەکاری دێنین ، کەچی جارێك دەڵێین (باوکم)و جارێکیش (باوکەکەم) • جگە لەمەش ئەم بۆچوونە لە بنچینەدا ڕاست نی‌یەو لەگەڵ یاساکانی‌تری زمانی کوردیدا ناگونجێ، چونکە وەك ئاشکرایە ناو لە کوردیدا کە پاشگری ناسیاویی پێوە نەبێت بە واتای « گشت » بەکاردێت‌و لە ڕووی واتاوە کۆیە نەك تاك • بۆنموونە کە دەڵێین : ( بەرەو شاخ دەڕۆن ) یان (منداڵ هەر وایە) ، ئەوە لێرەدا وشەی (شاخ) یان (منداڵ) لە واتادا وشەیەکی تاك نی‌یە • لەبەرئەوەی مەبەستمان لە گشت منداڵێك‌و لە گشت شاخێکە ، بۆیە نەك هەر نەناسراوە ، بەڵکو ژمارەشی دیاری نەکراوەو بێ‌سنوورە (بڕوانە : مەکەنزی ، ل ٥٠) • کەم‌و کورتی‌یەکی‌تری ئەم بۆچوونە لەوەشدایە کە ناتوانین چمکی ژمارە کەمی تەواو دیاری بکەین • بەوێنە لە ڕستەی «قۆڵم ئازاری گەیشتووە»دا ، دەڵێین « قۆڵ » یەکسەر خۆیەتی

وەردەگرێت ، چونکە ژمارەی (قۆڵ) لە سروشتدا کەمە ، خۆ ئەگەر قۆڵی هەموو مرۆڤێك وەرگرین ، ئەوە لە ژمارە نایەت ••• خۆ ئەگەر وابێت قۆڵی کورسیش لەدوان زیاتر نی‌یە ، کەچی هەرگیز نالێین « بێ‌زەحمەت وریا بە ، قۆڵی شکاوە ) • کەواتە لە مەسەلەی کەمی‌و زۆریی ژمارەدا کێشەمان پترە•

ب ــ بۆچوونی دووەم بەلای منەوە لە هیی یەکەم پەسەندترو سەرکەوتووترە ، چونکە دەتوانین بڵێین لە کوردیدا دوو جۆر خۆیەتیمان هەیە :

١ــ خۆیەتیی ئاشنا (١٠) •

٢ــ خۆیەتیی نائاشنا •

١ــ خۆیەتیی ئاشنا بۆ ئەوە شتانە بەکاردێت ، کە پارچەیەکن‌و بیانەوێ یان نەیانەوێ لە خاوەنەکانیان جیانابنەوە • ئەو شتانە تاپۆ کراون‌و بە خاوەنەکانیانەوە لکاون• ڕێزمانی کوردی بۆئەوەی لە خۆیەتیی نائاشنا جیایان بکاتەوە بە شێوەیەکی جیاواز لەگەڵیاندا دەجوڵێتەوەو بە شێوەیەکی تایبەتی بەپیریانەوە دەچێت • ئەم شتانە یەکسەر پاشگری خۆیەتی‌یان پێوە دەلکێ بێ‌ئەوەی بناسرێن • بە وێنە بڕوانە ئەو ڕستانەی خوارەوە :

---

(١٠) زمانەوانەکان لەوباوەڕەدان کە خۆیەتیی ئاشناو نائاشنا لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا هەن . خۆیەتیی ئاشنا ئەو شتانەدەگرێتەوە کە بمانەوێ یان نەمانەوێ پێمانەوە لکاون‌و لێمان نابنەوە ، وەکو سیماو ئەندامانی لەش‌و ئەو وشانەی پێوەندی خزمایەتی دەردەبڕن. خۆیەتیی نائاشناش ئەو شتانە دەگرێتەوە کە بە ئارەزووی خۆمان دەبین بە خاوەنیان ، وەکو کەل‌وپەل‌و جل‌وبەرگ ... ئەمانە لەوانەیە خاوەنەکانیان بگۆڕن یان ماوەیەك لەلایان بمێننەوە . هەندێ زمان ( بۆنموونە فەرەنسی ) ئەم جیاوازی‌یەی خۆیەتی لە ڕێزماندا دەردەبڕن ، بەوەی فۆرمی جیاواز جیاواز لەگەڵ ئەم شتانەدا بەکاردێنن . بە باوەڕی من کوردیش ئەم جیاوازی‌یە بەهۆی ڕیزکردنی پاشگری خۆیەتی‌یەوە دەردەبڕێت . بۆ وەرگرتنی زانیاریی پتر لەمبارەیەوە ، بڕوانە کارەکانی زمانەوانی ئەمەریکایی ( فیل‌سۆر ) .

دەستم شــکا ؟
سنگ دەیەشێت ؟
قاچی نایــە بانی
مامان ساڵی جارێك نایە بەلاماندا •
دڵی نەخۆشــە
باوکی بەخێویان ئەکات

ئەم شتانە دوو کۆمەڵ پێکدێنن : ا ــ کۆمەڵێ ناو کە سیماو پارچەکانی لەشن ؛ ب ــ کۆمەڵێ نــاو کە پــلەی خزمایــەتیو نــاسیاوی دەردەبڕن • کۆمەڵی دووەم لە دووکاتدا پاشــگری ناســین پێش خۆیەتی وەردەگرن : یەکەم ــ ئەگەر زیاتر لە یەکێك هەبێت ، وەك :

مامەکەیان بەجێیەێشتوون •
نەنکەکەتان چۆنە ؟
خوشکەکەت لەچیدایە ؟
براکەت خەریکی چی‌یە ؟

دووەم ــ ئەگەر ناوەکە بە مانای مەجاز بەکاربێت ، وەك :

باوکەکەم بۆ وا دەکەیت ( لێرەدا باوکی ئاسایی نی‌یە ، بەڵکو منداڵیشە ) •
دایکەکەم وا نابێت ( بێ‌گومان دایکی خۆی نی‌یــە ، بەڵکو لەوانەیە هەر شووشی نەکردبێ ) •
کوڕەکەم تۆ لە دنیا ناگەیت ( مەرج نی‌یە کوڕی خۆی بێت ، ئەگەر واش‌بێت ، چمکی خۆیەتی بووە بەژێر سۆزەوە ) •

٢ــ خۆیەتیی نائاشنا • ئەم جۆرە بۆ ئەو شتانە بەکاردێت کە پارچەیەك نین لە خاوەنەکانیان ، ناوبەناو دەستدەگۆڕنو هەمیشە نالکێن پێیانەوە •

ڕێزمانی کوردی بەوە جیایان دەکاتەوە کە هەرگیز بێ پاشگری ناسین نایاندات بە کەس • زوربەی وشەکانی زمانەکەمان لەمانەن ، وەك :

فەرشەکەتم فرۆشت
کراسەکەمم درووەوە
پاندانەکەتانم بەخشی

ئەم بۆچوونە بە تەواوی چارەسەری کێشەکەمان دەکات • نەك هەر ڕاستییەکانی سەرەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە ، بەڵکو تێشمان دەگەیەنێ ، بۆچی ئەم دوو کۆمەڵە ڕستەیە پەسەندن •

| | |
|---|---|
| سنگم دێشێ | سنگەکەم داکوتا |
| دڵی نەخۆشە | دڵەکەم بوچی نازانی وا باوە ؟ |
| دانم دێشێ | دانەکانی کولن |

– ٩ –

## شوێنی پاشگری خۆیەتی لە فرێزو ڕستەدا

لە بەشەکانی پێشووتردا ( ٥و ٦ ) بۆمان دەرکەوت کە پاشگری خۆیەتیی ئاسایی بەدوای ناوەوە دەلکێت، بەڵام لە فرێزو ڕستەدا ئەم پاشگرە جێ گۆڕکێ دەکاتو بە شوێنیترەوە دەگیرسێتەوە :

**أ ــ لە فرێزدا : (١)**

پاشگری خۆیەتی هەروەکو پاشگری کۆو ناسینو نیشانەی بکەر بە

(١١) فرێز یان دەستەواژە لە کوردیدا چەند جۆرێکی هەیە . باشترین لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم باسە کە بەرچاوم کەوتبێت لێکۆڵینەوەکەی مەکارەسە ( ل ٩٣ )و لێرەدا زۆر بەکورتی دەیخەمەڕوو :
فرێز لە کوردیدا دەبێت بە دوو بەشی سەرەکییەوە :

کەرتی دووەمی ( دواکەرتی ) فرێزەوە دەلـکێت ، وەك لـەو نموونانـەی خوارەوەدا دەردەکەوێت :

کاڵەکو شووتی‌یەکەمم فرۆشتەوە
( کاڵەکو شووتی + ەکە + م + م )

---

١ ــ فرێزی ناوی ، کە لە دوو شێوەدا دەبینرێت :
ا ) کورت ؛ ب ) درێژکراوە ( گەورەکراو ) .

فرێزی ناوی بەلای کەمەوە دیارخەرێکو دیارخراوێکی تێـدایە ، بەنموونـە :

منداڵی بچووك ( کورت )
ناوی تـۆ ( کورت )
پیـاوی باشـ ( کورت )
چـەند ڕۆژ ( کورت )
گەلێ کەس ( کورت )
دوو منداڵی بچووك ( گەورەکراو )
ئـەم ئیشـەی تـۆ ( گەورەکراو )
سەعات دووی پاش نیوەڕۆ ( گەورەکراو )

٢ ــ فرێزی کرداری . ئەمیش دیسانەوە دوو شێوەی هەیە :

أ ) کورت . وەك : دەرکرد ، بانگ‌کرد ، ئامادەکرد ، فێرکرد ، پـاك‌کرد .

ب) گەورەکراو . وەك : تێك‌دەدرا ، پەند ... پێدا ...

دیسانەوە فرێزی کرداری بەلای‌کەمەوە دەبێت دیارخەرو دیارخراوێکی تێدا بێتو دیارخراوەکە پێشـەوە دەگرێت .

جگە لەمانە، منیش لەوڕایەدام، ئەگەر دوو وشە بەهۆی (و)ەوە پێکەوە ببەسترێن ، یان بێتو وشـەیەك ئامرازی پێوەندی پێش بکەوێت دیسانەوە بە فرێز بژمێررێ . ڕەوشتی پاشگرەکانی کوردی ( کە بەدوای وشـەوە دەلکێن ) تەواو ئەم ڕایەم دەسەلمێنن . بەوێنە :

لەگەڵ هاوڕێکەمدا هاتم
بـەدواتا دەگەڕێم
کاڵەکو شووتیم کڕیوە .

چەند قوتابی‌یەکمان خوێندنیان لە دەرەوە تەواو کردووە
(چەند قوتابی + ەکە + مان)
دەستی ڕاست‌و قاچی چەپمیان شکاند
(دەستی ڕاست‌و قاچی چەپ + م + مان)

ئەم نموونانە ئەوە دەردەخەن ، کە ڕیزبوونی پاشگرەکان لە فرێزدا جیاوازی‌یان نی‌یە لە ڕیزبوونیان لە وشەداو لەسەر هەمان یاسا دەڕۆن :

فرێز + (ەکە) + (ئان) + (خۆیەتی) + (نیشانەی بکەر) •
(کەوانەکان ئەوە دەگەیەنن کە هەر یەکێك لەو پاشگرانە دەتوانن ببن یان نەبن ، بەڵام کە هەبوون بەوجۆرە ڕیزدەبن) •

**ب ـ لە ڕستەدا :**

لە ڕستەدا پاشگری خۆیەتی لەژێر کاری نیشانەی بکەردا جێی خۆی دەگۆڕێت ، بەتایبەتی لەگەڵ کرداری ڕابوردوودا نیشانەی بکەر لە کردارەکە دەبێتەوەو هەوڵی پێشەوە دەدات‌و خۆی بە کراوەوە دەلکێنێت • ئەم جێ‌گۆڕکێ‌یەی نیشانەی بکەر جێ بە پاشگری خۆیەتییش لەق دەکات‌و ناچاری دەکات بەرەو دواوە هەڵبێت • دەتوانین ئەم جێ‌گۆڕکێ‌یەی نیشانەی بکەر بە تایبەتی‌یەکی زاری سلێمانیی زمانی کوردی دابنێین [١٢] • ئەو ڕستانەی خوارەوە ئەم ڕاستی‌یە ڕوون دەکەنەوە :

١ ـ دەستت شکاندم

---

(١٢) د. جەمال نەبەز لەو ڕایەدایە کە ئەم دیاردەیە (جێ‌گۆڕکێی پاشگرەکەسێکان) دیاردەیەکی نوێ‌یە لە زمانی کوردیدا ، بە واتایەکی‌تر ئەم گۆڕانە لە سەدەکانی ئەم دوایی‌یەدا بەسەر کوردیدا هاتووە . هەرچۆنێك بێت ، ئەم گۆڕانە نەك هەر زمانی کوردیی لە زمانە ئێرانی‌یەکانی‌تر جیا کردۆتەوە ، بەڵکو تاڕادەیەك زاری سلێمانییشی لە زارەکانی‌تر پچڕاندووە .

٢ ــماڵتان وێران کرم

٣ ــ پاندانەکەت بردم

٤ ــ دەستتان کردم بە زاخا

٥ ــ دەستت دەشکێنم

٦ ــ کە تۆ گەیشتیت ئەو دەستمی دەگرتەوە

٧ ــ ئەگەر دەستت بشکانمایە باوکم دەهاتە سەرت

٨ ــ دەستت بشکێنم

٩ ــ پاندانەکەمی شکاندووە

١٠ــ کە تۆ هاتیت کەلوپەلەکانمی دزیبوو

لە ڕستەکانی سەرەوەدا (١ ــ ٥) پاشگری خۆیەتی شوێنێکی نائاسایی گرتووە ، چونکە بەدوای کردارەوە لکاوە • ئەمەش لەژێر کاری نیشانەی بکەردایە ، چونکە هەروەك وتمـــان لەگەڵ کرداری ڕابوردوودا جێی خۆی دەگۆڕێتو هەوڵی پێشەوە دەدات • پاشگری خۆیەتی ناچار بەرەو دواوە دێت • لە ڕستەکانیتردا (٦ ــ ١٠ ) شوێنی ئاسایی خۆی گرتووە (بەدوای مولکەکەوە لکاوە • بەوجۆرە ڕیزبوونەی لە بەشی [٥]دا دەرمان خست ) • ڕستەکان ئەوە دەردەخەن کە جێگۆڕکێی پاشگری خۆیەتی تـــەنها لەگەڵ کرداری ڕابوردووی سادەدا دەبێت • لەگەڵ کرداری ڕانەبوردوودا پاشگری خۆیەتی ئاسان بەدوای ناوەوە دەلکێت ، ئەمــەش ڕەوشـــتی ئاســـایی خۆیەتییە لە زۆربەی زمانەکانیتریشدا • بەوێنە :

دەستت دەشکێنم •

ماڵت وێران بێت •

پاندانەکەتان بەکاردەهێنم •

تاکە هۆ بۆ ئەم ڕەوشتە ئاساییە ئەوەیە کە لە ڕانەبوردوودا نیشانەی بکەر شوێنی ئاسایی خۆی دەگرێت (دەلکێت بە کردارەوە)و پاشگری خۆیەتی ناچار ناکات شوێنیتر بۆ خۆی بدۆزێتەوە •

## - ١٠ -

## گاگلی باسەکە

١ ـ دیارە خۆیەتی لە کوردیدا بە زیاتر لە ڕێگایەك دەردەبڕێت • هەندێك لەم ڕێگایانە لەوانیتر کەمتر بەکاردێن • جێناوی لکاو زیاتر لە هەموان بەکاردێت • بەکارهێنانی جێناوی «هی •••» تەنیا لە قسەدا دەبێت • (ی)ی ئیزافە لە کوردیدا بەکارهێنانی زۆرە ، بەڵام مەرج نییە هەر پێوەندی خۆیەتی دەربڕێت •

٣ ـ لەکوردیدا پاشگری خۆیەتی (جێناوی لکاو) لە شێوەدا تاڕادەیەك هەر ئەو پاشگرانەن کە دەبن بە نیشانەی کردار یان کراو ، بەپێچەوانەی پاشگری کرداری‌یەوە کە ئەمان لە کەسی سێیەمدا زۆر ڕێكوپێکن (لە «ی» شوێن نییە ، وەك لە هەندێ زمانیتردا دەیبینین •

٣ ـ لەکوردیدا پاشگری خۆیەتی (جێناوی لکاو) لە شێوەدا تاڕادەیەك هەر ئەو پاشگرانەن کە دەبن بە نیشانەی کردار یان کراو ، بەپێچەوانەی پاشگری کرداری‌یەوە کە ئەمان لە کەسی سێیەمدا زۆر ڕێكوپێکن (لە «ی» بەولاوە هیچیتر بەکارنایەت) • هەروەها لە کۆدا (ین)و (ن) بەکارنایەن • بەمجۆرە وامان بە ڕاست زانی کە پاشگری جێناوی لکاو بکەین بە دوو بەشەوە : ١ـ پاشگری خۆیەتی (کە زۆر جار بۆ خۆیەتی بەکاردێت) ؛ ٢ـ پاشگری کرداری (کە هەر بە کردارەوە دەلکێت) • (بڕوانە : بەشی ٥) •

٤ــ پاشگری خۆیەتی کە لەگەڵ پاشگریتردا کۆدەبێتەوە شوێنێکی تایبەتیی دەدرێتێ ، هەمیشە لەدوای پاشگری دیاریکردنەوە دێت ، بــەلاَم نیشانەی بکەری بەدوادا دێت • هەرچەندە لە زاری سلێمانیدا زۆربەی کات پاشگری خۆیەتی بە دوای ناوەوە دەلکێت، بەلاَم بەدوای کرداری ڕابوردووی تێپەڕیشەوە دەبینرێت • لەگەڵ هەندێ ناودا پاشگری خۆیەتی ڕاستەوخــۆ خۆی دەلکێنێو پاشگری دیاریکردن وەرناگرێ (بڕوانە : بەشی ٨) • بــۆ چارەسەرکردنی ئەم دیاردەیە بە پێویستمان زانی خۆیەتیی ئاشناو نائاشنــا لە یەکتر جیابکەینەوە •

# بنەڕەتیەکانی ڕەخنەسازی و هۆنراوەی دێرینی کوردی

**الدكتور : كامل حسن عزيز البصير**

ئەندامی کۆڕی زانیاری عێراقی و
پرۆفیسۆری یاریدەدەر
لە کۆلیجی ئەدەبیات زانکۆی سلێمانی

ڕەخنەسازی واتە : (النقد الادبي) پەیوەندی بە هەڵوێستی چەشەیی خوێنەر و گوێگر دەرهەق بە بەرهەمێکی وێژەییەوە هەیە و لە بەرپابونیدا ئاکامی ئەو هەڵوێستەیە :

مێژوونوسەکانی ئەم چالاکییە ئادەمیزادیانە لە بەر تیشکی ئەو ڕاستیەدا بیروڕایان وایە کە ڕەخنەسازی لەگەڵ لەدایکبونی هۆنراوەدا دێتەکایەوە و یەکەم ڕەخنەساز پاش گوێگرتن ، یاخود خوێندنەوەی بەرهەمی یەکەم هەستیار تێبینیە ڕەخنەسازییەکانی دەچەسپێنێ و بەردی بناغەی سامانی نەتەوایەتی لەم کۆڕەدا بنیات دەنێ • کەوابو تەمەنی ڕەخنەسازی هەر میللەتێك لە میللەتەکانی سەر زەوی بە قەد تەمەنی هۆنراوەی هەستیارەکانیەتی • جا ئەگەر بمانەوێ مێژوی ڕەخنەسازیی ئەو میللەتە بنوسینەوە پێویستە ئەو مێژووە لەگەڵ ئەڵقەکانی زنجیرەی مێژوی وێژەکەی ڕێكبخەین و هەنگاو

به هەنگاو دوابەدوای هەمو بەرهەمێکی وێژەیی بۆ بەرهەمێکی ڕەخنەسازی بگەڕێین • پرسیاریش لێرەدا ئەوەیە ئایا ڕێچکە مێژوییەکانی ڕەخنەسازی لەڕوی چەندەوە بە پێوانەی ژمارەی میللەتان دەژمێررێن یاخود لە مێژوی ئەم چالاکی‌یە ئادەمیزادی‌یانەدا چەند ڕێچکەیەك دەست‌نیشان کراون ؟

مێژوی ڕەخنەسازیی جیهانی بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە دو بناغەی چەسپاندووە یەکەم : بونی تیورییەکی فەلسەفی تایبەتی بە میللەتێك و بلاوبونەوەی ئەو تیوری‌یە وەکو بیروباوەڕێکی مرۆڤایەتی و ڕەنگدانەوەی لە چەشنەکانی هونەر و هەلسەنگاندنی هەمو لایەنەکانی ژیان •

دووەم : دانانی کتێب و لێکۆلینەوەی ڕەخنەسازی لە دێرترین سەردەمەوە و پەخش‌بونەوەی ئەو کتێب و لێکۆلینەوانە و دەنگدانەوەیان لە دەرەوەی جوغزی نەتەوایەتیی دانەرەکانیان و ئەمجا مانەوەیان سەردەم بە سەردەم •

لەبەر تیشکی ئەم دو بناغەیەدا تێبینی دەکرێ ، کە لە جیهاندا دو ڕێچکەی مێژویی دێرینی ڕەخنەسازی بەرچاودەکەون : (ڕێچکەی) مێژوی ڕەخنەسازیی ئەغریقی و ڕۆمانی کە بنەواشە و بنج و بنەوانی ڕەخنەسازیی ئەوروپی هاوچەرخە و ڕێچکەی مێژوی ڕەخنەسازیی دێرینی عەرەبی کە سەرچاوەی ڕەخنەسازیی زوربەی نەتەوە موسلمانەکانە •

ئەم دو ڕێچکە مێژویی‌یەی ڕەخنەسازی لە ڕوانگەی هەندێ مێژونوسەوە لە کۆنترین سەردەمەوە چەشنە پەیوەندی‌یەك لە نێوانیاندا بەدی‌دەکرێ و بە هۆی ئەم پەیوەندی‌یەوە کاریان لە یەکتر کردوە و لە هەندێ کتێبی دێرینی ڕەخنەسازیی عەرەبیدا وەکو کتێبی (نقد الشعر)دانانی قدامە کوڕی جعفر و کتێبی (معیار الشعر) نوسینی کوڕی طباطبای علوی شوێنەواری ڕەخنەسازیی ئەغریقی بە ڕونی هەستی‌پی‌دەکرێ • هەروەها ڕەخنەسازیی

ئەوروپی که لەسەر بنەواشه و بنج و بنەوانی ڕەخنەسازیی ئەغریقی بنیاتنراوه
له سەرەتاوه له ڕێگای وەرگێڕانی کتێبی (بیوتیکا)ی ئەرستۆ بۆ سەر زمانی
عەرەبی هەنگاوی هەڵگرتوه و کەوتۆته نش‌ونما و پەل‌هاویشتن • ئەم
تێبینی‌یه مێژوویی‌یانه سەبارەت بە پەیوەندیی نێوانی هەردو ڕێچکه
مێژوویی‌یەکانی ڕەخنەسازی ڕەنگه جێگای مشت و مڕی مێژوونوسەکانی
ڕەخنەسازی بن و ئەم مێژوونوسانه له سەری یەکدگیر نەبن ، بەڵام ئەوەی
لەم ڕووەوه ساغ‌بۆتەوه ڕەخنەسازیی ئەوروپی لەم سەردەمەدا کۆڕە
وێژەیی‌یەکانی زوربەی نەتەوەکانی داگیرکردوه و باڵی بەسەر مێشك و
هەست و نەستی ڕەخنەسازه نائەوروپیەکاندا کێشاوه •

ئەم دیاردەیه هەڵبەت نیشانەیەکی تەندروستی و پەسەندکراو نیه ،
چونکه ڕەخنەسازی هەرچەنده له ڕوی سروشتییەوه زانستێکه و زانستیش
دەشی چوارچێوەیەکی جیهانی و مرۆڤایەتی هەبی بەڵام بەرلەمه ڕەنگ و
بۆن و بەرامێکی هونەری هەیه و ئاوێنەی ڕۆشنبیری نەتەوایەتی‌یه ئەم
ڕاستیەش ئەوه دەسەپێنی که ڕەخنەسازیی هەر نەتەوەیەك دەبی له تایبەتی‌یه
مێژوویی و کومەڵایەتی و ئابوریەکانیەوه به ڕادەی یەکەم هەڵقوڵابی •

ئەگەر لێرەدا هێڵی گشتی لێکۆڵینەوەکەمان بەرەو باسی ڕەخنەسازیی
کوردی ڕابکێشین دەتوانین پەنجه بۆ باری لاسایی‌کردنەوەی
ڕەخنەسازەکانمان درێژبکەین و دوپاتی بکەینەوه که ئەم ڕەخنەسازانه له
چاو ڕەخنەسازه نەتەوه موسڵمانەکانەوه به ئیجگاری خۆیان له وێژەی
کوردی ڕاستەقینه بچڕاندەوه به بی ئەوەی چاوێك به ڕەخنەسازیی ڕەسەنی
سەر بەم وێژەیه بخشێنن به گوڕ شوێن‌پێی ڕەخنەسازه ئەوروپی‌یەکان
هەڵدەگرن و کوت‌ومت زاراوه و پێوەرەکانیان دەسەپێنن نەك بەسەر
بەرهەمی وێژەره تازەکانماندا بەڵکو دەرحەق به هەستیاره دێرینەکانمانیش :
بۆ نمونه زۆر جار له کتێب‌و ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردیدا دەخوێنینەوه که

ئەم هەستیارە دێرینە کوردیی یە (کلاسیزم) و ئەوەی دی (ریالیزم) و ڕێبازی (ڕۆمانیزم) سەرچاوەی فلان تۆسەرە و بە زۆرەملێ وێژەی کوردیی دەخرێتە بەر نەشتەری بێگانە و چەشـــە و چێــژە نەتەوایــەتیی و مرۆڤایەتـــیەکەی تێکدەدرێ •

هۆی ئەم بارە خەفەتهێنەرە ڕەنگە نەبوونی سامانێکی ڕەخنەســازیی بە زمانی کوردیی بێت و ڕەخنەسازە هاوچەرخەکانمان ئەم هۆیە بکەن بـــە بیانۆی لاسایی‌کردنەوە و بڵێن کوانێ ڕەخنەسازیی دێرینـــی کوردیی و کێ دەڵێ ئێمە کەسایەتیەکی نەتەوایەتیمان لە کۆڕی ئەم زانستەدا هەیە ؟ !

ئێمە بێ‌شك نامانەوێ لەم لێکۆڵینەوەیەدا سەرزەنشتی کەس بکەین و بە چەشنێکی تیوری و نەزەریی بەشداریی بەرپەرچدانەوەی بیروڕا نایارەکانمان بکەین بەڵکو دەمانەوێ ڕاستیەك دۆپات‌بکەینـــەوە کە دەڵــێ : نەبـــوونی سەرچاوەی ڕەخنەسازیی دێرینی کوردیی لەبەر دەستماندا بە هیچ کلۆجێك ئەوە ناگەیەنێ کە ڕەخنەسازیی کوردیی نەبوە و ڕۆژێ لە ڕۆژانیش لە دایك نابێت بەڵکو دەشێ ئەم ڕەخنەسازیی یە هەبوبێت و لە کۆڕی پێگەیاندنی هەستیارە دێرینەکانماندا ئەرکێکی گرنگی بەدیی‌هێنابێ بەڵام سەرچاوەکانی ئەم ڕەخنەسازیی یە لە چنگی فەوتان ڕزگاری نەبوە و نەگەیشتۆتە دەستمان•

ئەم بیروڕایە دۆبارە ڕەنگە هەر قسەی تیۆریی بێت بەڵام بەڵگەیەکمان بە دەستەوە هەیە بۆ سەلماندنی بیروڕاکەمان ، ئەم بەڵگەیەشمان هۆنراوەی دێرینی کوردیی یە کە لە دۆ تویێی دیوانە بـــە دەست‌گەیشتوەکانماندا دێڕە هۆنراوە گەلێ بەرچاو دەکەون کە دەنگ‌دانەوەی بزۆتنەوەیەکی ڕەخنەسازیی دەوروبەری هۆنەرەکانیانە •

ئەم بەڵگەیە ڕەنگە خۆی لە خۆی‌دا پرسیارێك بەرپابکات کە دەپرسێ ئایا ئـــەو دێڕانە ڕەخنەســـازیی کوردین و بەســـەر چاوەی ڕەخنەســـازیی

دەژمێررێن ؟ بەر لەئێمە هەندێ مێژوونوسی وێژەی کوردی [1] ئاگایان لـە کۆمەڵێك لـەو دێڕانە بوە و هۆنەرەکەیان بـە ڕەخنەساز داوەتە قـەڵەم ، سەرئەنجام وەڵامی ئەو پرسـیارەیان ناڕاستەوخۆ بەوە داوەتەوە کە ئـەو دێڕگەلانەی هۆنراوەی کوردی ڕەخنەسـازیی کوردین و بە سـەرچاوەی ڕەخنەسازیی دەژمێررێن • ئەم وەڵامە بێ‌گومان بیروڕایەکی زانستی نیە،چونکە چەمەکی واتە مەفهومی ڕەخنەسازی لەسـەر ئەوە یەکدگیرە کە ئـەم کارە ئاکامێکی زانستی و هونەرییە و ئەنجامدەرەکەی پشـت دەبەسـتێ بـە شێوازەکانی توێژینەوە و شیکردنەوە و بەراوردکاری لـە هەڵسەنگاندنی تێکستی وێژەیی و ئەم شێوازانەش هەڵبەت تەنیا بە پەخشان ئەنجامدەدرێن نەك بە دێڕە هۆنراو کە بە کۆت و زنجـیری کێش و سـەروا دەرفەتەکەی ئێجگار تەنگەبەرە ، جگە لەمە ئەگەر لە ناوەڕۆکی ئەو دێڕە هۆنراوانە خۆیان وردببینەوە بۆمان ساغدەبێتەوە کە هۆنەرەکانیان بە زۆری باسـی ڕادەی هەستیاریەتی خۆیان یانهاوڕێ هەستیارەکانیان دەکەن •

سەرئەنجام ئێمە بیروڕامان وایـە کە ئەو دێڕە هۆنراوانە لـە بابەتی شانازیکردن واتە فخر و ستایش واتە مدح دەدوێن و سنوری ئەو بابەتەش چەند بنەڕەتێکی ڕەخنەسازی دەگرێتەوە کە بـە زۆری لە شانازیکردن و ستایشکردنی ڕوونبێژی و بەرزی پایەی هەڵبەست لە ڕووی وشە و واتاوە و چەند مەسەلەیەکی دی هونەری هۆنراو • بەڵام سەرەڕای ئەم ڕاستیە ئەو شانازیکردن و ستایشکردنە ڕووناکیەك دەخەنە سەر بزووتنەوەی ڕەخنەسازی لە سـەردەمی هەسـتیارە خاوەن ئـەو دێڕانـە و چۆنیـەتی نرخپێدانی

---

(١) بڕوانە : کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی دانانی عبدالله شاڵی و د. عزالدین مصطفی و علاءالدین السجادی و د. امین علی سعید و کمال محمود و فریدون علی امین و ابو زید السندی و نوری علی امین . چاپخانەی عیراق . ل ــ ١٠٨ .

هەڵبەستدەستنیشان دەکات و چەشە و چێژی خوێنەران و وێژەدۆستان دەخاتە ڕۆ و دەیسەلمێنێ کە هەستیارەکانمان لە ژێر کارتێکردنی چلۆن هەڵوێستێکی ڕۆشنبیریێ و ئایدیۆلۆجیێو هونەریێ بوون و سەرچاوە ڕەخنەسازیەکانیان چی بوون •

ئەرکی ئەو دێڕەهۆنراوانە لە کۆڕی ڕەخنەسازیدا ئەگەر هاتو لەم تەرز و چەشنە بۆ هەڵبەت نرخێکی مەزنی هەیە چونکە بە هۆیەوە دەتوانین چەند ئەڵقەیەکی وونبۆ لە زنجیرەی تەمەنی ڕەخنەسازیی کوردیێ لەسەر بناغەی قەبلاندن و بۆچونی مێژوییێ ببوژێنینەوە و سەرنجی وێژەرانی هاوچەرخمانی بۆ ڕابکێشین • هەرچۆنێك بێت هەستیارە خاوەن ئەو دێڕە ڕەخنەسازیێیانە لەڕوی ژمارەوە زۆرن چونکە بە دەگمەن هەستیارێك نابینیت شانازیێ بە هەڵبەستەکانی نەکات و ستایش ئاراستەی دۆست و هاوبیروڕاکانی نەفەرمویێ ، بەلام ئەوانەی لەو هەستیارانە بە چەشنێکی هەڵکەوتو کارەکەیان ئەنجامدابێت و هونەرمەندانە لەسەر دەستیاندا پێوانەی ڕەخنەسازیێ ڕەنگی دابێتەوە ( نالیێ و سالم و کوردیێ و حاجی قادری کویی )ن بۆیە ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەولی شیێکردنەوەی دێڕە ڕەخنەسازیێیەکانی ئەم هەستیارانە دەدەین و بیروڕا نرخناسییە هونەرییەکانیان دەچەسپێنین •

نالیێ کە لە سالی ١٨٠٠ ز لەدایكبووە و لە سالی ١٨٥٦ ز ماڵئاوایێ لەم جیهانە کردوە لە زوربەی هەڵبەستەکانیدا بە دێڕەهۆنراو هێمای بۆ چەند بنەڕەتێکی ڕەخنەسازیێ کردوە[٢] •

بنەڕەتی سەرەکیی ڕەخنەسازیێ لە دێڕەهۆنراوەکانی ئەم هەستیارەدا تەنگوچەڵەمەی پەیوەندیی هەستیارە بە کۆمەڵەکەیەوە : ئایا ئەم کۆمەڵە لە

---

(٢) بڕوانە : دیوانی نالی لێکۆلینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم . چاپخانەی کوری زانیاری کورد . بەغدا ١٩٧٦ .

زادەی بیری هەستیارەکەی تێدەگات و نرخی هەڵبەستەکانی دەزانێ و سوودی لێ وەردەگرێ ، یاخود بە پێچەوانەوە کۆمەڵێکی تێنەگەیشتوە و شایستەی هۆنراوەی بەرز نیە و قەدری هەستیاران نازانێ ؟

ناڵی بە شێوازێکی کاریکاتێریی بێباکانە وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێ :

**( ناڵی ) حەریفی کەس نیە ، ئیلف و ئەلیفی کەس نیە**
**بەیتی ڕەدیفی کەس نیە ، هەرزە نویسە گەپ دەکا (٣)**

ئەم بارەی کۆمەڵی کوردەواری لە سەردەمی ناڵیدا تەنگ‌و چەڵەمەیەکی ڕۆشنبیری بەرپادەکات کە بە چەشنی پرسیارێك خۆی دەنوێنێ و دەپرسێ : کە کۆمەڵ لە هەستیارەکەی تێنەگات و نرخ و پلەی نەزانێ ئەم هەستیارە بۆ کێ هۆنراوە دەنووسێت ؟

ناڵی ناڕاستەوخۆ ئەم تەنگ‌وچەڵەمەیە بەرپادەکات و دەڵێ :

**عومرێکە بە میزانی ئەدەب توحفە فرۆشم**
**زۆرم وت و کەس تێینەگەیی ئێستە خەمۆشم**
**لەو گەردەن و عیقدە کە پڕە گەردەن و گۆشت**
**بەو پێیە کەنارم کە پڕە دامەن و کۆشم (٤)**

لەم دوو دێڕەدا ئاشکرایە کە ناڵی دەمێك بوو هۆنراوەی بەرزی دەهۆنییەوە ، بەڵام ڕادەی ڕۆشنبیریی کۆمەڵەکەی نزم بوو ، سەرئەنجام بڕیاری بێدەنگی و گۆشەگیری دا . ئەم بڕیارە لە ڕوانگەی ڕەخنەسازییەوە ئەوە ساغ دەکاتەوە کە ناڵی هۆنراوەی بۆ کۆمەڵەکەی نەدەهۆنیەوە و لە ڕادەی ڕۆشنبیری و هونەری بەرزی خۆی نەدەهاتە خوارەوە ، یاخود ـ بە دەربڕینێکی دی ـ ئەم هەستیارە هەڵبەستی بۆ کۆمەڵەکەی دانەدەنا ، بۆیە

---

(٣) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ، ١٠٠ .

(٤) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٨٠ .

کە زانی ئەم کۆمەڵە پێی ناکرێ لە هەڵبەستەکانی تێبگا دەستی لە وتنەوەی هۆنراوە هەڵگرت •

ئەو هەڵوێستەی ناڵی هێما بۆ بابەتێکی ڕەخنەسازیی گرنگ دەکا کە پەیوەندیی بە سەرچاوە و سروشتی هۆنراوەوە هەیە ، چونکە ئەگەر هاتو پەیوەندێ لە نێوانی هەستیار و کۆمەڵەکەیدا بەو چەشنە پچڕابێ لە چ سەرچاوەیەکەوە هەڵبەستەکانی هەڵدەهەنجێنێ و سروشتی ئەم هەڵبەستانە چلۆنە ؟

هەستیارەکەمان لەم ڕووەوە دەڵێ :

**« لا حول ولا طول ولا قوة الا**
**بالله ، له القدرة ، والكائن ماشا »**
**( ناڵێ ) نییەتی سیحری بەیان ، حیکمەتی شیعرە**
**ئەمما نییەتی قووەتی دڵ ، قودرەتی ئینشا (٥)**

کەوابێ بە لای ناڵییەوە هێزی دڵ سەرچاوەی هۆنراوە و قودرەتی ئینشایە • هێزی دڵ و قودرەتی ئینشا و هەمێ تواناکانی وەکو ئادەمیزادێك بە دەستی خواوەیە • ئەم بۆچوونەی ناڵی سەبارەت بە سەرچاوەی هۆنراوە ڕەنگە لە بیروڕاکانی ئیفلاتونەوە ئەنجامدرابێ : کە دوپاتیان کردۆتەوە سەرچاوەی هۆنراوە خواکانە و هەستیار بە خورپە و ئیلهام لە ئاسمانەوە هەڵبەستەکانی وەدەست دەهێنێ •

ڕەنگەش بەو چەشنە نەبێ هەستیار کە بەو جۆرە لە قووەتی دڵ و قودرەتی ئینشای دواوە وەکو موسڵمانێك لە بیرۆکەیەکی ئاینیی گشتییەوە باری خۆی دەربڕیوە • ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەم بیرۆکە ئاینییە گشتییە سەرچاوەی هەستیاری هاوچەرخمان مامۆستا گۆران بووە کە وتویەتی :

---

(٥) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ل ٧٨ .

**دەست و پەنجە و مەچەکێك و نیگایەك**
**چی بنوسم ؟ خوایە هێزی ئینشایەك (٦)**

مامۆستا گۆران لەم دێڕەدا ملکەچی سۆزێکی ئاینیی‌یە و بۆ دەربڕینی هەست و نەستی لە خوا دەپاڕێتەوە کە هێزی ئینشای پێ ببەخشێ •

هەرچۆنێك بێت ئـەگەر دوبارە سەرنج لـە دێڕەکانی نالیی بدەینەوە سەرچاوەی ئاینی ئیسـلامیی بۆچونەکەی زیاتر سـاغدەکاتەوە ، چونـکە سروشتی هۆنراوە کە بە لایەوە سیحری بەیان و حیکمەتە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەرەوە دەستنیشانی کردووە ، کە دەڵێ : « ان من البیان لسحراً وان من الشعر لحکماً » :

ئەم دەستنیشانکردنەش لـە کۆڕی ڕەخنەسازیدا دوو لایەنی گرنگی هۆنراوە دەخاتە ڕوو : لایەنی فۆڕم ، کە کارتێکردنەکەی وەکو کارتێکردنی جادوگەریی و سـیحرە و ، لایەنی ناوەرۆك ، کە مەبەسـتی ڕاسـتەقینەی ئامۆژگاریی و ڕابەریی هۆشمەندیی و عەقلیی‌یە •

نالیی لەم دوو لایەنەی هۆنراوەدا هەڵبەت هیچ زاراوەیەکی ڕەخنەسازیی نە بـە عەرەبیی و نە بـە کوردیی بەکارنەهێناوە ، بـۆیە ئـەو لێکدانەوەیە ڕاڤەکردنێکی کەسیی‌یە ، جا ئەگەر بمانەوێ لەم ڕووەوە بزانین نـالیی چلۆن ڕووانیویەتیە مەسەلەی ڕەگەزەکانی هۆنراوە ، با گوێ لەم دێڕانەی بگرین کە دەڵێ :

**شەبنم کە نەظم و نەثرە لە ئەوراقی غونچەدا**
**گۆیا بووە بە زار و زوبان و ددان و پۆك**

---

(٦) بڕوانە : دیوانی (بەهەشت و یادگار) و (فرمێسك و هونەر) لە هەڵبەستی (لە دەرزی پەچەوە) مامۆستا گۆران . چاپخانەی معارف بغداد . ل ٤١ .

**( نالی ) عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا**
**مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفظی کەم و بچوك (٧)**

لێرەدا نالی زاراوەی مەعنا و لەفظ بەکاردەهێنێ و ڕوونی‌دەکاتەوە کە هەڵبەست پێك هاتووە لە دوو ڕەگەزی جیـاواز و لەیەکترپچڕاو : ڕەگەزی واتا و ڕەگەزی وشە •

هەروەها سەرنجمان ڕادەکیشێ بـۆ پێوانەیەکی ڕەوانبێژیی عەرەبی دێرین کە بە ئیجاز ناو دەبرێ و بەوە پێناسەکراوە کە دەربڕینە لە واتایەکی زۆر بە وشەیەکی کەم یاخود هەر وەکو خۆی دەڵێ ( مەعنای زۆر و گەورە بە لەفظی کەم و بچوك ) •

سەرئەنجام دەنگدانەوەی ئەم تێڕوانینەی نالی سەبارەت بە ڕەگەزەکانی هەڵبەست لە ڕەخنەسازیی کوردیدا ڕەنگە هەڵوێستێکی لاسایی‌کردنەوە بێت و هەستیارەکەمان لە نواندنیدا شـوێن‌پێی ڕێبـازی کوڕی‌قوتەیبەی هەڵگرتبێ کە لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا هۆنراوی عەرەبی لەبەر تیشـکی پێوانەی وشە و واتادا هەڵسەنگاندوە • هەرچەندە لە چەند شوێنێکی تری دیوانەکەی زیاتر نرخی بـە بیرۆکە و واتـا داوە هەروەکو لـەم دێڕانەی خوارەوەدا دەردەکەوێ :

**شاهیدی فیکرم کە بێتە جیلوەگاهی دولبەری**
**شاهی خوسرەو ڕۆحی شیرینی بە قوربانی دەکا (٨)**
**کەس بە ئەلفاظم نەڵێ خۆ کوردی‌یە خۆکردی‌یە**
**هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی طالیبی مەعنا دەکا (٩)**

---

(٧) بڕوانە : دیوانی نالی : لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم • چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا • ١٩٧٦ • ل ٢٦٠ •

(٨) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ١٠٣ •

(٩) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ١٠٧ •

لە ڕەوانبێژیی عەرەبیی دێرین‌دا بنەڕەتێکی دیٖ ڕەخنەسازیٖ بە دوور و درێژیٖ شیکراوەتەوە کە پەیوەندیٖ بە لایەنی سەرچاوە و سروشت و ڕەگەزەکانی هۆنراوەوە هەیە، ئەم بنەڕەتیەش مەسەلەی چۆنیەتیٖ ئەنجامدان و ڕێکخستنی هۆنراوەیە •

زاناکانی ڕەوانبێژیی عەرەبیٖ لەم ڕووەوە تیٖ‌بینیٖ دەکەن کە هۆنراوە یان بە سەرپیٖ‌یٖ و لە طەبعەوە ئەنجام دەدریٚ یان لە ڕێگای صنعەت و پیشەسازیٖ‌یەوە دروست‌دەکریٚ • نالیٖ لە عاستی ئەم مەسەلە ڕەخنەسازیٖ‌یە بیر و ڕایەکی یەکدگیری نیە ، چونکە هەندیٚ جار دەڵیٖ :

**هەر چاوەییٖ کە وشك و عەقیمی بوڵەندییە •**
**وەك طەبعی من بە نەظمی خوشی نەغمە زایەوە (١٠)**

هەروەها دەڵیٖ :

**خەڵقی کە هەموو کوردەکن و بەستە زوبانن**
**با بێن و لە « نالی » ببیەن شیعری سەلیقیٖ (١١)**

واتە : هەر کانیاو و سەرچاوەیەك بە هۆی بەرزیی شوێنەکەیەوە وشکاییٖ هاتبیٖ و ئاوی لەبەر نەڕوا ، لەم بەهارەدا تەقیوەتەوە ، وەك چۆن سروشتی من بە شیعری خۆش‌ئاواز تەقیوەتەوە و هەمیشە شیعری جوان لە سەرچاوە و کانیاوی دەمم لێشاوئەکا • ئەم خەڵقە هەمو منالْ و نەفامن و زمانیان بە یەکا دیٚ هیچ لە شیعری ڕاستەقینە تیٖ‌ناگەن • بڵێن بابێنە لای (نالیٖ) ، شیعری خۆیان بۆ بخوێنێتەوە کە وەك ئاوی ڕەوان لە خۆیەوە دیٚ، بەڵکو زمان و بیریان بکرێتەوە و فێری چەش‌کردنی شیعر و ئەدەب بن•کەچی هەندیٚ جاری‌تریش شانازیٖ بەوەوە دەکا کە توکی قەلەمەکەی بیەویٚ واتا

---

(١٠) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٥٥٤ .
(١١) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٦٥٧ .

بڕازێنێتەوە و باسی جوانیی بکا ، هەر دێڕێکی ئەوەی ئەینوسی نیگارێك ئەنوێنێ لە نیگارە نایابەکانی ( مانیی )ی نیگارکێشی بەناوبانگ و مەعناکە بە ڕادەیەك ڕۆشن ئەکاتەوە ببێ بە شتێکی دیاریی و هەستپێکراو و بینراوی وەك نیگارە دیاریەکانی مانیی :

**نوکی خامەی من کە بێتە مەعنا ئارایی کەمال**
**خەط بە خەط ئیظهاری نەقشی صوورەتی (مانی) دەکا (١٢)**

کەوابوو هۆنراوە پایەبەرزەکەی ئاکامی صونعەتکاریی و وردکاریی یە و بەلایەوە ئەم وردەکاریی و صونعەتکاریی یە نموونە بێهاوتاکەی لە هونەری جوانکاریی واتە (علم البدیع) بەرچاو دەکەوێ کە لەو چواوی (مشبەبە) قژی دلبەرەکەیەتی :

**زولفەینی بە خەم مار و بە حەلقەن وەکو عەقرەب**
**شیعری لەف و نەشرن ، چ موشەووەش ، چ مورەتتەب (١٣)**

هەروەها بەوە شانازیی دەکا کە هەڵبەستەکانی وەکو دەریا قوڵن • واتە : بەرهەمی تێفکرین و لێکدانەوەن نەك ئاکامی سەلیقە و سەرپێیی :

**بەحری غەزەلم پڕ لە دوڕ و گەوهەرە ، ئەمما**
**غەوواصی دەوێ یەعنی بە تەعمیقی بزانە (١٤)**

بەم پێیە زیاتر تایبەتیی وردەکاری هەڵبەستەکانی دەخاتە ڕوو سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە بە خەیاڵی هۆنراوەی پڕ لە وردەکاریی خۆی کە ئەڵێی تاڵەموی باریکە صەد داوی ناوەتەوە بۆ هەر هەستیارێك ، داوی وا کە بە هیچ کلوجێ سەری لێ دەرنەچێ :

---

(١٢) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ١٠٣ .
(١٣) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ١٣٣ .
(١٤) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٤٨٠ .

**« نالی » بە داوە شەعری دەقیقی خەیالی شیعر**
**بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرە صەد داوی نایەوە (١٥)**

ئەو دێڕانەی هەستیارەکەمان کە دۆپاتی ڕۆگەی وردەکاریی لە هۆنینەوەی هەلبەستدا دەکەن لە چاو دێڕەکانی شانازیی کردن بە سەلیقەی دانانی هۆنراوە ئێجگار زۆرن [١٦] ئەم زۆرییە لەگەڵ شێوازی هۆنینەوەی هەڵبەستە شاکارەکانیدا ئەوە دەچەسپێنێ کە ڕێبازی ڕەخنەسازیی نرخپێدانی هۆنراوە لەبەر تیشکی وردەکاریی و پیشەسازیی ئاخاوتندا لە سەردەمی نالییەوە زاڵبوبو بەسەر ڕێبازی هەڵسەنگاندنی ئەم هونەرە لە ڕوانگەی داهێنان و طبع و سەلیقەتەوە •

ئەم دیاردەیە لە دەرفەتی هۆنراوەی کوردیدا هەڵبەت ئاکامی دەنگدانەوەی ڕەخنەسازیی و ڕەوانبێژیی عەرەبیی ئیسلامییە کە بڕبڕەی پشتی ڕۆشنبیریی مزگەوتییە لە ناوچەی کوردەواریدا ، چونکە ئاشکرایە کە ئەم ڕۆشنبیرییە لە بناغەدا بابەتە سەرەکییەکەی قورئانی پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەرە لەگەڵ ئەو زانستانەی یارمەتیی خوێنەرەکان دەدەن لە کۆڕی فێربونی ئاینی ئیسلام بە تایبەتی زانستی ڕەوانبێژیی و بێهاوتایی قورئانی پیرۆز و زانستی منطق و کەلام •

جگە لەمە لە ڕوی مێژووەوە ڕۆگەی وردەکاریی دێرترین سەردەمی تەمەنی ڕەخنەسازیی و ڕەوانبێژیی ئیسلامیی و عەرەبییەوە ڕەگوڕیشەی داکوتاوە و چەکەرەی کردوە و سەوز بوە و لە زۆرانبازیی دژ بە ڕۆگە ڕەخنەسازییەکانی دی پەرەی سەندووە و سەرکەوتووە : بەڵگەش بۆ چەسپاندنی ئەم ڕاستیە لە قورئانی پیرۆزەوە وەدەست دەهێنرێ : قورئانی

---

(١٥) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو . ل ٥٥٥ .

(١٦) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٤٨١ ، ل ١٠٧ ، ل ٥٧٠ ، ل ٥٢٣ .

پیرۆز لە دەستنیشانکردنی سەرچاوەی هۆنراوەدا زاراوەی (فێرکردن)ی بەکارهێناوە و دەربارەی پەیوەندیی پێغەمبەر ــ د.خ بە هۆنراوەوە ووتویەتی:

( وما عَلَّمناهُ الشِعْرَ وما ينبَغي لَهُ ) [١٧] •

زاراوەی (فێرکردنیش) لــە فەرهەنگەکانی زاراوەی عەرەبیدا واتای وەدەستهێنانی هونەرێك یاخود زانیارییەك دەردەبڕێ کە لــە رێــگای دەستور و بنەواشەی زانستییەوە ئەنجامدرابێ •

ئەم واتایە هەڵبەت لە واتای زاراوەی ( وەحی ) و زاراوەی ( ئیلهام ) ئێجگار جیاوازە ، چونکە زاراوەی وەحی [١٨] لــە قورئــانی پــیرۆز و فەرهەنگەکانی زاراوەی عەرەبیدا بە مانای گەیاندنی کاروبار و زانیارییەك هاتووە لە خواوە بە هۆی فریشتەیــەکەوە بــۆ پێغەمبەرێــك و زاراوەی ئیلهام [١٩] کە بەرامبەرەکەی بە زمانی کوردی ووشەی خورپەیە هەرچەندە مەبەستەکەی گشتییە بەڵام دووبارە پەیوەندی هەیە بە بارێکی دەروونییەوە لە بابەتی وەجد و فیض و حلول و زاراوەکانی دی تصوفی فەلسەفیانە •

جا کە قورئانی پیرۆز زاراوەی وەحی و زاراوەی ئیلهامی لەو جوغزەی ڕەخنەسازییەدا بەکارنەهێنابێ و زاراوەی فێرکردنی سازکردبێ ، بێ‌گومان ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کە چەمەکی هۆنراوە لەژێر سـێبەری ڕۆشنبیریی عەرەبی ئیسلامی ڕەسەندا هیچ پەیوەندییەکی بە (شەیتانی هۆنراو) و دۆڵی عەبقەر و فیض و طبع و خورپە و ئیلهامەوە نەبــوە ، بــەڵکو ئــەو چەمەکە ئاکامی تێڕوانینێکی ژیانی و بوونی بوە و ئەوەی سەلماندوە کە ئەم هونــەرە چالاکییەکی ئادەمیزادانەیە •

---

(١٧) سوورەتی یاسین ئایەتی ٦٩ .

(١٨) بڕوانە : الكليات ابو البقا ، ايوب بن موسى الحسين الكفوي چاپخــانەی وزارەی ڕۆشنبیری بغداد ١٩٧٤ . ل ٢٨٥ و ٢٨٦ .

(١٩) بڕوانە : التعريفات : الشريف الجرجاني ل ٣٥ .

ئەم سەلماندنە هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ مێژووی هۆنراوەی عەرەبیدا پەرەی سەند و بۆ بە پاڵپشتی تاقمێك لە هەستیارانی عەرەب و موسلمان لە سەدەی سێیەمی کوچیدا وەکو (بشاربن برد)، (مسلم بن الولید)، (ابو تمام) کە بە ( اصحاب البدیع ) واتا : یارەکانی جوانکاری لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا ناو دەبرێن و بەوە ناوبانگیان دەرکردوە کە لە شێوازی هۆنراوەدا ڕۆدەکەنە پیشەسازیی ئاخاوتن و بە زۆری وردەکاری و شیرینکاری لە دەربڕینی هەست و نەستیاندا بەکاردەهێنن •

ئەم ڕۆگەیە لە هۆنینەوەی هۆنراوەدا هەروەکو وتمان دژ بە ڕۆگەی طبع و سەلیقە هەمیشە لە زۆرانبازیدا بۆ ، لە سەدەی پێنجەمی کۆچییەوە بەرهەمەکانی لە کتێبەڕەوانبێژییەکاندا بوون بە نمونەی مەشق و پراکتیکی پیشەسازیی هۆنراوە و پەخشان • تەنانەت لە دانەرەکانی ئەم کتێبانە : (سکاکی) لە دۆتوێی کتێبە بە ناوبانگەکەی (مفتاح العلوم)دا سیٚزانستەکەی ڕەوانبێژی واتە : (زانستی ئاخاوتن و زانستی ڕۆنبێژی و زانستی جوانکاری) بە چاوی کۆتایی مەبەست لە هۆنینەوەی هۆنراوەدا تەماشاکرد و بڕیاری ئەوەیدا کە ئیعجاز و بیٚهاوتایی قورئانی پیرۆز لە وردەکاریدا خۆی دەنوێنیٚ • ئەم کتێبەی سکاکی ــ هەروەکو زانراوە ــ بۆ بە تاقە سەرچاوەی رەوانبێژی نەك بە زمانی عەرەبی و بەس بەڵکو بە زمانە موسلمانەکانی دیش بە تایبەتی زمانی فارسی ، بۆیە هەرچی کتێبی ڕەوانبێژی دوابەدوای ئەم کتێبە دانرا هەر کورتکردنەوە و ڕاڤەکردنی دانراوەکەی سکاکی بوون ، هەستیارانیش کە لەسەر دەستی ئەم دانەرانە فێری زمان و ڕۆشنبیری و زانیاری دەبۆن بەوە قایلبۆن کە هۆنراوە بۆ ئەوەی پایەبەرز بێت دەبیٚ لە کارگەی وردەکاریدا بهۆنرێتەوە •

ئەم قایلبۆنە لەگەڵ چەند هۆیەکی ئابۆری و ڕامیاری و کۆمەلایەتی وایان لە هۆنراوەی سەدەکانی ناوەڕاست کرد کە جگە لە یاریکردن بە

هونەرەکانی رەوانبێژیی لە رێکخستنی هەڵبەستدا هیچی تر نەبێ بە ئامانجی هونـەریی •

سەرئەنجام نـالی کە لـەو دێرانـەیدا شـانازیی بـە وردەکاریـی هەڵبەستەکانیەوە کردوە و ملکەچی ئەو دۆخە رۆشـنبیریی و زانیـاریی و زانستیە بووە • هەڵبەت بنەرەتێکی گرنـگی رەخنەسـازیی کە لـە سـەر دەمەکەیدا باوبووە تۆمارکردوە و گەیاندویەتیە دەستمـان و مێژونـوسی رەخنەسازیی کوردیی بە هۆی ئەم کارە مێژوییـیە گرنگەوە دەتوانێ دیاردەی وردەکاریی لە هۆنراوەی دێرینی کوردییدا راڤەبکات و هۆیەکانی بخـاتە رۆ ئەمجا سەرچاوەکانی دەست نیشان بکات [20] •

ئەم راستیە رەخنەسازییە هەڵبەت دیاردەی لاساییکردنەوە لە هۆنراوەی سەردەمی نالییدا دەخاتە رۆ و سەرنج بۆ ئەوە رادەکێشێ کە چەشە و چێژی خەڵکی لەسەر خوێندنەوەی هەڵبەستی شێواو و رازاوە راهاتبو بەڵام لـە هەمان کاتدا ئەم هەستیارە بلیمەتە راسـتیەکی دیی لە کۆڕی رەخنەسازییدا دەخاتە بەر دەستمان و شانازیی بەوەوە دەکا کە خۆی یـەك کەسە و ئەوەی ئاگای لە هەمو هەڵبەستەکانی هەبێ بۆی دەردەکەوێ کرداری ( خرق العادة) زۆر رۆئەدا یا کەم :

**« نالی » یەك و ئەو کەس کە تەماشای غەزەلی بیست**
**مەعلومی بووە زۆر و کەمیی خاریقی عادات (٢١)**

لە شـوێنێکیتری دیوانەکەی ئەم مەبەسـتە زیاتر روونـدەکاتەوە و

(٢٠) بڕوانە : کتێبی خۆشخوانی کە دانەرەکەی مامۆستا علاءالدین سەجادییە کە لە دو توێیدا بـە نمونە هۆنراوەی کوردیی بـۆ هەمو چەشـنەکانی رەوانبێژیی هێناوەتەوە .

(٢١) بڕوانە : دیوانی نالی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم . چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ل ١٤٤ ، بەغدا ١٩٧٦ .

دەی‌سەلمێنێ کە شان‌بەشانی دیاردەی لاسایی‌کردنەوە لە هۆنراوەی کوردیدا دیاردەی خولقاندن و داهێنانیش هەبووە :

**« نالیا » ئەم غەزەلەت تازە بە تازە وتووە**
**بە دوصەد ( مەثنەوی )یو ( لوبی لوباب )ی نادەم (٢٢)**

ئەم هەستیارە هەڵکەوتوە کە شانازیی بە هەڵبەستە خوڵقاو و داهێنراوەکانی دەکات دووپاتی دەکاتەوە کە سەرچاوەی ئەم دیاردەیە لە هەڵبەستەکانیدا موعانات و هەستی راستەقینەیە :

**بە بێ دیداری تۆ خۆ لاڵە « نالی »**
**عەجەب هەستاوە ئەم چەن فەردە بێ تۆ (٢٣)**

هەروەها دووپاتی‌دەکاتەوە کە هۆی سەرکەوتنی بەسەر هەستیارەکانی هاوسەردەمیدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خاوەنی تاقی کردنەوەیەکە لە هۆنینەوەی هەڵبەستدا :

**ئەم سەرسەری بازانە کەوا هەمسەری بۆمن**
**موشکیل ، بگەنە ساعیدی شاهێکی وەکو من**
**تا نەشئە نەچێژن لە لەبی کەوثەری ساقی .**
**بێچارە چوزانن کە هەمو مەستی زەوقومن ؟ ! (٢٤)**

کەوابێ لەبەر تیشکی ئەم دێڕە هۆنراوانەی نالیدا بۆمان ساغ‌دەبێتەوە کە بنەڕەتی داهێنان و خولقاندن و بنەڕەتی موعانات و تاقی‌کردنەوە لە ڕەخنەسازیی کوردیدا بە چەشنێك بەرچاودەکەون و سنورێك بۆ دیاردەی لاسایی‌کردنەوە و جوێنەوە لە هەڵبەست‌دانادا دەچەسپێنن :

---

(٢٢) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٣٠٨ .

(٢٣) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٣٨٠ .

(٢٤) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٣٣١ .

ئەم هەستیارە دیارە ویستویەتی ئەم دوو بنەڕەتیە ڕەخنەسازیە زیاتر ڕوون بکاتەوە ، بۆیە لە هەمان ڕوانگەوە باسی پەیوەندیی نیوانی هەستیار و بەرهەمەکانی کردوە و ووتویەتی :

**لە جگەر گۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خراپ**
**بێ خەطا کەس نییە ڕاضی کە لە ئەولادی درێ (٢٥)**

واتە باش لە هەڵبەستەکانم حاڵی بین و بەڕاستی مەعنایان لێك بدەنەوە ، هەڵبەستەکانم منالی جگەر گۆشەمن ، بە خراپ لێ حاڵی بونیان دەیانخەنە بەر فەلاقە و دارکاری • هیچ باوکێك ڕازی نییە منالێکی خراپەیەکی نەکردبێ ، بە ناحەق لێی بدرێ • ئەم وێنەیە هەروەکو دیارە ئەوپەڕی سۆزی ڕاستەقینەی هەستیار بەرامبەر بە زادەی هەست و نەستی دەردەبڕێ و ئەوە دەسەلمێنێ کە هەڵبەست پارچەیەکە لە هەست و نەستی هەستیار • جا بۆیە لە ڕوانگەی ئەم سەلماندنەوە هەستیارەکەمان لە کارتێکردنی هەڵبەستەکانی دەدوێ و دەڵێ :

**ڕاستی جەوهەرییە تیغی زوبانی « نالی »**
**نەرم و توند ، ئاوی گەلوگیرە ، قصەی پی دەبڕێ ••(٢٦)**

ئەم دووانە بە لای ئێمەوە هێمادەکا بۆ بنەڕەتێکی ڕەخنەسازیی گرنگ کە پەیوەندیی هەیە بە مەسەلەی لایەنەکانی هۆنراوەوە : لایەنی هەستیار کە سەرچاوەی داهێنانی هۆنراوەیە و لایەنی گوێگر و خوێنەر کە بەرەی وەرگرتنی بەرهەمی هەستیارە و لایەنی هۆنراوە کە ئەڵقەی جەزب و ڕاکێشانە لە نێوانی دوو لایەنەکەی پێشوودا •

---

(٢٥) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٦٥٤ •
(٢٦) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٦٥٤ •

نالی بە بۆنەی چەند بابەتێکەوە شانازی بەوە دەکات کە دەتوانێ هۆنراوە بە زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی هەڵبەست بهۆنێتەوە :

**ئیستیطاعە و قووەتی طەبعم ، بە کوردی و فارسی**
**عارەبی ، ئیظهاری چالاکی‌یو چەسپانی دەکا (٢٧)**
**فارس و کورد و عەرەب هەرسێم بە دەفتەر گرتووە**
**« نالی » ئەمڕۆ حاکمی سێ مولکە ، دیوانی هەیە ! (٢٨)**

ئەم شانازی‌کردنە ڕەنگە بنەڕەتیەکی ڕەخنەسازی بچەسپێنێ و لەبەر دەستی‌دا مەسەلەی پەیوەندیی نێوانی وێژەی عەرەبی و وێژەی فارسی و وێژەی کوردی بەرپابکات جا ئەگەر وابێ هەڵبەت لە دەوروبەری ئەو بنەڕەتیە دوو بابەتی بەراوردکاری خراونەتە بەر لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە :

یەکەم : کارکردنی ئەو سێ وێژەیە لە یەکتر و چلۆنی ئەنجامدانیان لەلایەن هەستیارێکەوە و ڕادەی ڕۆشنبیریی نەتەوایەتیی ئەو هەستیارە و لایەنەکانی توانای هۆنینەوەی هەڵبەست لەم زمانەوە بۆ زمانیکی تر •

دووەم : بابەتی دانانی بەرهەمی هەستیارێك بە ئاکامی بیر و هەست و نەست و سۆز و ئەندێشەی تایبەتیی خۆی ئەگەر هات و زمانی ئەو بەرهەمە زمانی زگماکی هەستیارەکە نەبێ •

ئەم دوو بابەتە بێ‌گومان لە ڕەخنەسازیی هاوچەرخماندا بڕبڕەی پشتی لێکۆڵینەوەی وێژەی بەراوردکارین ، ئێمەش هەرچەندە ناتوانین بڕیار بدەین کە ئەم چەشنە لێکۆڵینەوەیە لە سەردەمی نالیدا باڵی بەسەر کۆڕە وێژەیی و ڕەخنەسازیە کوردییەکاندا کێشابێ بەلام بۆمان هەیە کە بڵێین تۆوی لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری لەو زەمینەی ڕۆشنبیریی دەوروپشتی نالی و

(٢٧) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ١٠٤ •
(٢٨) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٥٧٧ •

هەستیارە هاودەمەکانیدا وەشێنرابێ ، ئەگەر هاتو ئەو تۆوە چەکەرەی نەکرد و سەوز نەبێ ئەمجا نەشونمای نەکرد لەبەر چەند هۆیەکی زانستی و کۆمەڵایەتی ئەو بارە بەرپابێ •

لە هەمان جوغزەوە نالی شانازی دەکا بەوەی کە زمانی هەڵبەستەکانی کوردی‌یە :

**طەبعی شەککەرباری من ، کوردی ئەگەر ئینشا دەکا**
**ئیمتیحانی خۆیە مەقصودی ، لە ( عمدا ) وا دەکا**
**یا لە مەیدانی فەصاحەتدا بە میثلی شەهسەوار**
**بێ تەئەممول بەو هەمێ نەوعە زوبانی ڕادەکا**
**کەس بە ئەلفاظم نەڵێ خۆ کوردی‌یە خۆکردی‌یە**
**هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی طالیبی مەعنا دەکا (٢٩)**

واتە ( زەوقی شیرینی من کە بە لای ئەوەدا ئەچێ بە کوردی شیعر بڵێ لەبەر ئەوە نییە کە کوردییەکە ئاسانە و دەسەڵاتی بەسەر عەرەبی و فارسیدا ناشکێ ، بەڵکو لەبەر ئەوەیە ئەیەوێ خۆی تاقی بکاتەوە بزانێ شتێکی تازەی لەدەستدێ لەمەوپێش کەس نەیکردبێ کە شیعروتنە لەسەر عەرۆزی عەرەبی بە زمانی کوردی ، یانە ؟ )

یاخود مەبەستی خۆتاقی‌کردنەوە نییە ، تەبیعەتی شیعریەتی ئەوەندە سوارە بێ گوێدانە ئەوە کە مەیدان مەیدانی فارسی یا عەرەبی یا کوردی‌یە ئەو هەرلەخۆیەوە بە هەموویاندا ئەداتە غار ، یا لە هەموویاندا خۆی رائەهێنێ•

هەرچۆنێك بێت با کەس توانجم تێنەگرێ بڵێ شیعرەکانی کوردین و هەر شاعیرێك بگری ئەتوانێ شیعری کوردی بڵێ • بەڵێ ڕاستە زۆر کۆلکە شاعیر ئەتوانن (شیعر) بە کوردی ڕێك‌خەن ، بەڵام خۆ شیعر هەرهاوسەنگیی دوسەرەکەی و یەکێتی دواپیتەکانی نییە • شیعر بەر لەهەرچی ناوەرۆکی

(٢٩) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ١٠٦ ، ل ١٠٧ •

ورد و مەعنای قوڵە و زانایان لە شیعردا بە دوای ئەوەدا ئەگەڕێن و ئەوەش دەستی کۆلکە شاعیرەکان ناکەوێ بیخەنە شیعرەکانیانەوە[٣٠] .

نالی هەڵبەت لێرەدا زۆرانبازی و گفتوگۆیەکی ڕەخنەسازی یەکی گرنگ تۆماردەکات و ڕوونی دەکاتەوە کە لە نێوانی ڕوناکبیرەکانی هاوسەردەمیدا بیروڕای جیاواز سەبارەت بە نوسینەوە بە کوردی و پێوانەی هەڵسەنگاندنی ڕەگەزەکانی هۆنراوە و دەست نیشانی هەستیاری پایەبەرز هەبووە و تێڕوانینی خۆشی لەم ڕووەوە چەسپاندوە . سالم کە لە ساڵانی ١٨٠٠ ـ ١٨٦٦ی زایینیدا ژیاوە هەرچەندە ژمارەی دێڕە ڕەخنەسازی یەکانی کەمە [٣١] ، بەڵام تا ڕادەیەك زوربەی بنەڕەتیەکانی ڕەخنەسازی لە دێڕە هونراوەکانی ناڵیدا باسکردوە :

ئەوەی لەم باسکردنە سەرنجمان رادەکیشێ سالم وەکو نالی دوپاتی دەکاتەوە کە خەڵکی لەسەردەمەکەیدا قەدری هۆنراوە و هونەریان نەدەزانی :

**ئەهلی زەمانە جەنبی هونەر ناکڕن بە هیچ**
**« سالم » مەکە هەوایی ئەمەل ئێستە بێ فلووس(٣٢)**

ئەم دوپاتکردنەوەیە هەڵبەت ئەوە دەگەیەنێ کە هەستیار هەڵبەستی بۆ خەڵکی نەدەهۆنیەوە و خەڵکیش بەشداریی ئاکامی ئەو هۆنینەوەیان نەدەکرد و هیچ بیروڕایەکی ڕەخنەسازی یان دەرحەق بەم بابەتە نەبو ، بۆیە ئێمە لەو باوەڕەداین کە تەنیا چینی ڕۆشنبیر لە مەلا و خوێندەوار و وێژەدۆستان بەو ئەرکە هەڵدەستان کە سەرچاوەی زانیارییان ڕۆشنبیری ئاینی بو :

---

(٣٠) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو و هەمان لاپەڕەش .
(٣١) بڕوانە : دیوانی سالم چاپی دووەم چاپخانەی کوردستان هەولێر . ل ٣٥
(٣٢) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٧٤ .

بەڵگەشمان بۆ چەسپاندنی ئەم راستیە دیسانەوە ڕۆگەی وردکاریێ و صنعەت کاریێیە لـــە دانانی هۆنراوەدا ، ئەم بەڵگەیەش بە ڕۆنیێ لـــە چەند جێگایەکی دیوانەکەی سالمدا خۆی دەنوێنێ :

**لە عەرصەی ئەوجی عەشقت بازی دڵ هەڵسا لە دەورانا**
**بە بەرقی پڕتەوی حوسنت پەڕی سوتا لە طەیرانا**
**لە ڕۆژی ئیمتحانا دیم بەرابەر طالب و مەعشوق**
**کەمەر بەستەی هونەر هاتن لە تیپی عیشق بازانا**
**لە یەکلا (( نالیێ و مشوی )) لە لایێ (( سالم و کوردیێ ))**
**لە هەنگامەی هونەر گەرمیێ تکاجۆ بوون لە (( مەولانا ))**
**لە مەیدانی بەلاغەتدا بە سوواری مەرکەبی مضمون**
**بە کوردیێ هەریەکە تازی سوواریێ بوون لە (( بابان)) (٣٣)**

کەوابێ مەیدانی ئەم دیمەنە لە دڵدار و دڵبەر و هونەرمەندان زانستەکانی بەلاغەیە بە هەمێ لایەنە ڕازاننەوە و شیرینکاریەکانیانەوە کە بێ گۆمان وانەی فێرکردن و لێکدانەوەبێون لە مزگەوت و خانەقا و تەکیێ وکۆڕە ئاینیەکانی دیێ و شۆڕەسوارانی وتنەوەی کتێبەکانی ڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆز و فەرمێدەکانی پێغەمبەر و مێژێی عەرەبیێ و ئیسلامیێ و صـــرف و نحو و فەرهەنگکاریێ و تصوف و زهد و دەیان بابەتی تر . سالم هەروەکو دیارە ســـێورە لەســـەر دووبارەکردنەوەی زاراوەی بەلاغەی عەرەبیێ ، تەنانەت لە گەڵیشیدا ووشەی « تعلیم » بەکاردەهێنێ و سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە قەڵەم ئەگەر بێتو لەم زانستە دووسێ بکات بەڵام هەمیشە لە عاستیدا دەبێت :

**قەلەم سەرخۆشە (( سالم )) بۆ تردد**
**لە تەعلیمی بەلاغەت مثلی مەرکەب (٣٤)**

بەلاغە واتـــە ڕەوانبێژیێ هەرچەندە لـــەم ڕۆژانەدا هەوڵدراوە لـــە

---

(٣٣) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٣٥ .

(٣٤) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٤٣ .

ڕەخنەسازیٚ جیابکرێتەوە بە بیانوی ئەوەی ئەم زانستە بابەتێکی پڕاکتیکی یە پەیوەندیٚ هەیە بە ڕازاندنەوەی زمانی وێژە لە سوچی تەنگەبەری فێرکردنەوە ، بەلاّم لە مەیدانی ڕۆشنبیریٚ مزگەوتیٚدا هەمیشە بڕبڕەی پشتی هەڵسەنگاندنی وێژە بووە و وەکو تاقە ڕێگایەك گیراوەتەبەر لەپێناوی سەلماندنی بیٚهاوتایی قورئانی پیرۆرو بەرزیٚ شێوازیٚ : سەرئەنجام ئێمە ڕامانوایە کە قەدرشوناسەکانی هۆنراوە لەبەر تیشکی هونەرەکانی زانستی واتا و زانستی ڕۆنبێژیٚ و زانستی جوانکاریٚدا لە هۆنراوەیان دەکۆڵیەوە و بەراوردیان لەنێوان هەستیاراندا بەرپادەکرد و بڕیاری پیشکەوتن یان دواکەوتنی بەرهەمی وێژەییان دەدا •

هەستیارەکەمان لە هەڵبەستێکی هەجووا سەبارەت بە میرزا سلێمانی زیندرۆی هەستیار لە هەمان ڕێچکەوە ئەو سەرئەنجامەمان بۆ دەسەلمێنیٚ و زاراوەی ڕەنگین و مضمون چەند هێمایەکیٚتر تۆمار دەکا و دەلیٚ :

**بو من قەلەمە نێزە بو تۆ سوپەرە دەزگا**<br>
**بۆ تەجرەبە با لێدەم یەك ضربە لە قەلغانت**<br>
**نوکی قەلەمم تیژە وەك نوکی درەوشی تۆ**<br>
**سۆهان زەدەیە فیکرم وەك گازنی بوزڕانت**<br>
**ڕەنگینە هەمو شیعرم وەك نەقشی تەکەلتوی زین**<br>
**مضمون کەشە فیکرم وەك قوللابی درۆمانت (٣٥)**

میرزا سلێمانی هەجوکراو بەم دێرانەی سالم لەبەر ئەوەی هەستیار بووە دور نیە بە هۆنراوە وەلاّمی هەجوکەرەکەی دابێتەوە و لایەنە شانازی پێکەرەکانی پوچەڵ کردبێتەوە لەعاستیاندا هونەرمەندیٚ قەلەمیٚو جوانکاریٚ شیوازیٚ و قولیٚ ناوەڕوکی هەڵبەستەکانی خستبێتە ڕو ، هەروەها دوریش نیە لەم ڕوگەیەوە تەکنیکی هونەری نقائضی عەرەبیٚ بەکارهێنابێت ، چونکە

---

(٣٥) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٥٠ و ٥١ .

هەروەکو لە روشنبیریی عەرەبێ ئیسلامیدا زانراوە بابەتی هەجو لەنێوانی دوو هەستیاردا لەبەر تیشکی دەستوری یەکیەتێ کێش و یەکیەتێ سەرواو و پوچەڵ کردنی واتای دژواردا ئەنجام دراوە • ئەم بۆچونەمان ڕەنگە جێگای مشتومڕ بێت ، بەلاّم بەڵگەنەویستە کە ئەو دیڕانە پێوانەی ڕەخنەسازیی وای نواندوە کە لە سەردەمەکەیاندا باوبونــە و لەلای چینی خوێنــدەوار زانراو بوون • هەرچۆنێك بێت ســالم دیارە لە بنەرەتیەکانی ڕەخنەســازیی سەردەمەکەی نەپچڕابو وەکو نالی بەشداری مەسەلەی زمانی هۆنراوەی کردووە و لــەم ڕووەوە دوپاتی کردۆتەوە کە کوردە :

**« مه فارس زبانم گفت « سالم » شرح حالت گو »**
**ووتم جانا بەڵەد نیم اصطلاحی ئێوە من کوردم (٣٦)**

هەروەها شانازی بە نرخی هەڵبەستە کوردیەکانیەوە دەکات و دەڵێ :

**زیرە سەرمایەیە بۆ « سالم » و « کرمان »ی دەبا**
**شیعری کوردی کە بدا جیلوە لەلای شێخی کبیر (٣٧)**

کوردی کە لەژێر هەمان خێوەتی سەردەمی و ڕۆشنبیری نالی و سالمدا تەمەنی بردۆتە سەر چونکە لە سالی ١٨٠٩ی زاینی لەدایك‌بووە و لە ســالی ١٨٤٩ی زاینیدا کۆچی دوایی کردووە لە هەمان ڕوانگەی هونەریەوە لــە هەڵبەستەکانیدا چەند بنەڕەتیەکی ڕەخنەسازیی خستۆتەڕوو ، جا بــۆ ئەمەی بزانین ئەم خســتنە ڕووە هەڵۆیستێکی کەســی نەبوە و تا ڕادەیــەکی زۆر دیاردەیەکی بیری بووە سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشین کە ئەم هەستیارە وەکو دوو هاوڕێکەی واتە : نالی و سالم سکالاّی لە دەستی هاوزەمانەی کردوەو وتویــەتی :

---

(٣٦) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٨٢ .
(٣٧) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٦٩ .

**دوڕ و یاقوت دەبارێ لەم کەلامە شیرنەی ( کوردیٚ )**
**خواسا کوا لە دونیادا قەدرزانێ ، خڕیدارێ (٣٨)**

کەوابۆ لە دونیای هەستیارەکەماندا کەس نیە قدرشوناسی هەڵبەستەکانی بێت ، بۆیە بۆمان هەیە کە بلێین کوردیٚ و هونەرەکەی لە دۆڵێکدا دەژیاو خەڵکی سەردەمەکەی لە دۆڵێکی‌تردا خۆشگوزاریان دەکرد • ئـەم بارەش هەڵبەت دۆبارە سەرچاوەی ڕۆشنبیریٚ هەستیارانی کورد لە هێڵێکی دۆر لـە جەماوەری کوردانەوە دەست‌نیشان دەکرد • هەستیارەکەشمان بە ڕۆنیٚ پەنجە بۆ ئەو سەرچاوەیە درێژدەکاتو دەڵیٚ :

**( کوردیٚ ) دلبَری عەرصەیی نەظم و فەصاحەتە**
**جەولان دەکا هەمیشە وەکو بەرقی تیژڕەو (٣٩)**

زاراوەی (نەظم) و زاراوەی فەصاحەی عەرەبیٚ لە ڕۆشنبیریٚ ئیسلامیٚ و ڕەخنەسازیٚدا واتاکانیان دەست‌نیشان کراون بـۆ هەڵسەنگاندنی بەرهەمی وێژەییٚ پێوانە تایبەتیەکانیان چەسپێنراون ، ( کوردیٚ )ش کە شانازیٚ بەو دۆ زاراوەیە دەکات دیارە هـەمۆ پێویستیەکانیانی بـەدیٚ هێناوە و ڕەزامەندیٚ چەشە و چێژی مامۆستاکانی سەردەمەکەی وەدەست‌هێناوە •

ئەم راستیەش دیسانەوە ژینگەی ڕەخنەسازیی کوردیٚ ئـەو سەردەمە ڕەنگ دەداتەوە و دۆپاتی دەکاتەوە کە ئەو ژینگەیە لە مشت و مڕ و گفتوگۆی زمانیٚ و ڕەوانبێژیٚ و عروض جمەی دەهات •

کوردیٚ جگە لەمە لە هەڵبەستێکیدا بە سەردێڕی ( دڵ لە محنەت کەیلە) لە باسکردنی ڕابواردن و طەرەب دەڵیٚ :

---

(٣٨) بڕوانە : دیوانی کوردی چاپی سێیەمین چاپخانەی کوردستان هەولێر ١٩٧٣ ، ل ٧٦ .

(٣٩) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٥٥ .

وا نیە ( کوردی ) مائلی ئەو جۆرە ئەتوارانە بێ
لازمە شاعر لە هەرچەشنێ بڵێ بۆ ئیمتیاز (٤٠)

لەبەر تیشکی ئـەم دێڕەدا دیارە کە چەمەکی هەسـتیاری سەرکەوتو خوێندنەوەی هەڵبەست بووە لە گشت بابەتەکانی هۆنراوە وەکو : ( ستایش و شیوەن و هەجو و دلداری و پیاهەڵدان و باسکردنی ڕابواردن و ڕاووشکار و بابەتەکانی دی هۆنراوەی سەدەکانی ناوەڕاست ) • جا ئـەگەر ئـەم چەمەکە دیاردەیەك بۆبێ بۆمان هەیە کە بڵێین تاقیکردنەوە و معاناتی تایبەتی هەستیار لەو سەردەمەدا بە تاقە سەرچاوەی هۆنراوەی ڕاستەقینە تەماشـا نەدەکرا و وێژەدۆستان ئـەوە بوە کە دەبێ هەسـتیار لە هەمو بابەتـەکانی هۆنراوە هەڵبەستێك یـان کۆمەڵە هەڵبەستێکی هـەبێت بۆئەوەی بـە هەستیاری سەرکەوتو بژمێررێ •

ئەم دیاردەیەش ئەگەر بەو چەشنە بۆبێت ڕاستیەك دەسەلمێنێ کە دەڵێ : هۆنراوەی کوردی لەو سەردەمەدا بە زۆری لاساییکەرەوە و تقلیدی بووە چونکە لە کۆڕی هونەری ڕەسـەندا ناشێ بەشـداری کەرەکەی توانای هۆنینەوەی هەمو بابەت و مەبەستەکانی هەبێت ، حاجی قادری کۆیی کە لە ساڵی ١٨٢٤ی زایینیدا لەدایكبوە و لە ساڵی ١٨٩٧ی زاینیدا ماڵئاوایی لەم جیهانە کردوە چالاکانە لە زوربەی هەڵبەستەکانیدا (٤١) بنەڕەتی ڕەخنەسازیی چەسپاندوە و لە ڕوانگەی تایبەتی خۆیەوە پێوانەکانیانی خستۆتە ڕو • ئەم بنەڕەتیانەش هەرچەندە لـە دێڕە هۆنراوەکانی نالی و سـالم و کوردیدا ڕەنگیان داوەتەوە ، بەلام لە ئاوێنەی هەڵبەسـتەکانی ئەم هەستیارەدا بـە چەشنێکی تازە دێنە بەرچاو :

---

(٤٠) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٢٧ .

(٤١) بڕوانە : دیوانی حاجی قادری کۆیی چاپخانەی هەولێر ١٩٦٩ ل ٢٤ و ٢٥ و ٢٦ و ٣٩ و ٤٢ و ٤٧ و ٤٨ و ٥٨ و ٦٢ .

ڕەنگە هۆی ئەم بارە ئەوە بێ : حاجی قادری کۆیێ زۆربەی ساڵەکانی تەمەنی لە شاری ئەستەمبوڵدا بردۆتە سەر و لە دەرفەتی شارستانیەتی و ڕۆشنبیریی ئەم ناوچەیە مێشك و طبعی خۆی زاخاو داوە و هەنگاوی بەرینی لە کۆڕی هەڵسەنگاندنی وێژەدا هەڵگرتوە ٠

ئەم ڕاستیە هەڵبەت نابێ ئەوە بگەیەنێ کە حاجی قادری کۆیێ لە سەرچاوەی ڕۆشنبیریی و ڕەخنەسازیی هۆنراوەی کوردیی دوورکەوتۆتەوە و خۆی بە ڕۆگەیەکی دیێەوە بەستووە :

بەڵگەشمان بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە ئەم دێڕانەی خوارەوەیە کە لە هەڵبەستە بەناوبانگەکەیدا ( شیوەن بۆ کەیفی ) هاتوون :

**زمانی کوردیو فارسیو تورکیو عەرەبی**
**وەهای دەزانی وەکو بەیتی خوسرەو و شیرین**
**ئەمەش دەلیلە لە تەئثیری مەرثییەی کە گوتم**
**چووار زمانی تێدایە قەصیدەیی ڕەنگین**
**ز لوحەی خط موزون قطعەی منظوم**
**خجل شد ( ابن هلال )و روان ( ابن متین ) (٤٢)**

لە بەردەستی ئەم دێڕانەدا دیارە کە حاجی قادری کۆیێ نەتەوەپەرست ستایشی شیوەنی کەیفی بەوە دەکا کە زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی زانیوە و ئەم زانینەش لە هەڵبەستەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە ٠ جا ئەم

(٤٢) بڕوانە : دیوانی حاجی قادری کۆیی چاپخانەی هەولێر کوردی ١٩٦٩ ، ل ٤٧ ٠ [ لەبەرئەوەی ئەو سەرچاوەیەی مامۆستای خاوەن وتار شیعرەکانی حاجی قادری لێ وەرگرتووە هەڵەی زۆری تێدایەو ، ئێمەیش سەرچاوەی دەستنووسی ڕاستی شیعری حاجیمان لابوو ، نەمانویست شیعرەکانی حاجی بەو هەڵانەوە بنووسرێنەوە ، بۆیە ڕاستمان کردنەوەو، ناکۆکیی نێوان تێکستی شیعرەکان لەم وتارەدا لەگەڵ چاپەکەی مامۆستا گیوی ڕەحمەتی ، کە سەرچاوەی خاوەن وتار بووە ، لەمەوەیە ـ سەرپەرشتیکەرانی چاپ لە کۆڕی زانیاری عێراق ] ٠

ڕەنگدانەوەیە لە تێڕوانینی هەستیارەکەمانەوە دەبێ چۆن بێت و لە چ ڕێ و شوێنێکەوە ئەنجام بدرێ؟ حاجی قادری کۆیی بە هیچ جۆرێك ئەم پرسیارەی بەرپا نەکردوە و وەڵامەکەشی لـە ژینگەکەیەوە هەڵنەهێنجانوە و، بـەڵام هەروەکو دیارە بـە هیچجۆرێك ڕای وا نـەبووە کە هۆنراوەی کوردی لاسایی کەرەوەی هۆنراوەی نەتەوەکانیتر ە :

**نالی‌یو خاکی بەبە حاجی‌یو کۆیە بە مەثەل**
**هەروەکو حافظی شیرازە کەلیم و هەمەدان (٤٣)**

ئەم بەراوردکاریە یەکتایە لەنێوانی ئـەو هەستیارە کورد و هەستیارە فارسانەدا ڕەنگە کاردانەوەی ئەو ڕۆگە ڕەخنەسازی‌یە بێ کە بە چاوی سوك هۆنراوە و زمانی کوردی تەماشا دەکرد و پاڵی بە نالی‌یەوە دەنا ــ هەروەکو لەمەوبەر بینیمان ــ شانازی بە زمانی نەتەوەکەی بکات و هەڵبەست هۆنینەوە بەم زمانە بە کارێکی گران و ئەرکێکی قورس دابنێ . هەروەها ڕەنگە ئاکامی هەڵویستێکی نەتەوایەتی بێت بەتایبەتی کە تێبینی دەکەین : ئەم هەستیارە بەو بەراوردکاریە یەکتایە ڕاناوەستێ، بەڵکو زیاتر هەنگاو هەڵدەگرێت و دەڵێ:

**شبیهی جۆلا کە ڕازی نەبێ بە سەردڕی خۆی**
**مەڵێن فەصاحەتی کوردی بە فارسی ناگا**
**بەلاغەتێکی هەیە هیچ زوبانێ نایگاتێ**
**لە بێ تەعەصصوبی کوردانە بێ ڕەواج و بەها**
**کە خۆتی تێنەگەیێنی، لە نیکتەکانی نەگەی**
**دەڵێی هەمۆی هەزەیانە خووا بەڵای لێ دا**
**بەڵام ئەوانی کە صەڕرافی زێڕ و زیوی قسەن**
**بە شاهـ ڕەوایە دەزانن چ سککەیێکە ڕەوا**
**چ حیکمەتێکە کە ئاثاری کوردە ناموسی**
**نە کیمیایە نە عەنقا لە بەینی ئومە نەما (٤٤)**

---

(٤٣) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٤٢ .

(٤٤) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو، ل ٢٥ .

لەم دێڕانەدا حاجی قادری کۆیی بڕیار گەلێکی ڕەخنەسازی دەدات و سەرئەنجامەکەیان بەوە دەخاتە ڕو کە هیچ هۆنراوەیەك ناگاتە ڕادەی هۆنراوەی کوردی • ئەم بڕیارگەلەش ڕەنگە پێویستی بە بەڵگە هەبێت بۆ ئەوەی خوێنەر پێیان قایل بێت، بەڵام لەبەر ئەوەی بە دێڕە هۆنراو پێشکەش کراون دەرفەتی ڕونکردنەوەیان نەبوە ئەوە نەبێ کە هێمادەکەن بۆ نوکتەو حیکمەتی هونراوەی کوردی وەکو دو لایەن لە لایەنەکانی بەرزیی هونەری •

جا ئەگەر هەر ئەم دو لایەنە شیاوی شانازی کردن بە هۆنراوەی کوردی بن مێژوتوسی ڕەخنەسازی تێبینی دەکا کە لە ڕەوانبێژیی عەرەبیدا زاراوەی نوکتە و زاراوەی حیکمە بۆ هەڵسەنگاندنی هۆنراوە لە ڕوی ناوەرۆك و واتاوە بەکارهێنراون •

ئەمە ڕاستیەکە ، بەڵام ئێمە تێبینی دەکەین کە هەستیاردکەمان لە هەمان هەڵبەستدا سەرچاوەی تایبەتی بەلاغە و فەصاحەت و نوکتە و حیکمەی هەڵبەستەکانی بە تاقیکردنەوەی کەسایەتی خۆی دەستنیشان دەکات و دەڵێ :

**ئەمانە زادەیی ئەفکار و خۆنەویستی منن**
**ئەگەر قەبیح و گەریهن وەنەر شەل و ئەعما**
**میثالی فەرخەیی ژۆشك کە پێی دەڵێ دایکی**
**ئیلاهی قاقومە یاخۆ سمۆرە یا دیبا (٤٥)**

هەروەها لە هەڵبەستێکی تردا دەڵێ :

**لە یەك دو لاوە هەتیوی لەپاش بەجێماوە**
**یەکێکی بیکری مەعانی دووانی طیفلی حەزین**
**ئەمن کە مامی ئەوانم دەیاندەمە ئودەبا**
**کچانی زادەیی طەبعی لەطیفی حوجلە نشین**

---

(٤٥) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو و هەمان لاپەڕە ل ٢٥ •

**وەلێ کوڕانی رەزا نین بە خاکی ڕوم و دەڵێن**
**لەلای ویلایەتەوە چاوەدێری مامێترین (٤٦)**

کەوابۆ حاجی قادری کۆیێ زیاتر لەسەر چاوەی هۆنراوەی ڕەسەن سور دەبێ کە طبع و زادەی کەسایەتی‌یە کەسایەتیش هەروەکو لەم دێڕانە و چەند دێڕێکی‌تر دەردەکەوێ هەندێجار ڕەنگێکی نیشتمانێ فراون وەردەگرێت :

**شیعرەکانم کە غەریبی وەتەن و نەو سەفەرن**
**وەرە بیخوێنەوە ئەم نوقطە ثەوابێکی هەیە**
**قەدری ( حاجی ) بگرن مەقصەدی هەر دیدەنی‌یە**
**وەرنە هەرچی بگری نانەك و ئاوێکی هەیە (٤٧)**

کەوابۆ لە دێڕە هۆنراوەکانی حاجی قادری کۆیێدا دروشمی هۆنراوەی داهێنراوی کەسایەتێ و خوڵقێنراوی ژینگەی خۆماڵێ بەرزدەبێتەوە ، بەڵام ئایا رەخنەسازیی کوردێ لەم ژینگەیەدا توانای ئەوەی هەبۆ لەم دروشمە تێبگاتو شێبکاتەوە و ڕێبازی لێکدانەوەی بچەسپێنێ و زاراوەکانی سازبکات و دەستور و بنەواشە و پێوانەکانی بخاتەڕۆ ؟ !
حاجی قادری کوێی ناڕاستەوخۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە و دەڵێ:

**نیە لە مومکینی ئیمکان خەتا و سەهوی نەبێ**
**بە غەیری خواجەیی دیوانی ( علم الاسماء )**
**ئەوی حەسوود و جەهوڵن لەئیم و ڕەخنەگرن**
**لە عەیب و ڕەخنەیی عالەم بەری دەبن ئودەبا (٤٨)**

لەم دێڕانەدا دیارە لە ژینگەی ڕەخنەسازیی کوردێدا کۆمەڵێك لە ڕەخنەگری حەسوودو نەزان و لەئیم هەبوون کۆمەڵێکی ئاواش بێگومان لە

(٤٦) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ل ٤٨ .
(٤٧) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٥٨ .
(٤٨) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٢٥ .

کۆڕی ڕەخنەسازیدا جگە لە عەیب دۆزینەوە و توانج گرتن هیچ کارێکی دی ئەنجام نادەن بۆیە حاجی قادری کۆیی لە دەستی ئەم کۆمەڵە پەنا دەباتە بەر قاپی خوا و دەپارێتەوە و دەڵێ :

**ئیلاهی نەیخەیە بەر چەنگی مەندەبوورو لەئیم**
**نقودی ( حاجی ) کە نەیدیوە خوسرەو و دارا (٤٩)**

حاجی قادری کۆیی زیاتر ئەم دیاردە ڕەخنەسازیە کوردیە ڕوون دەکاتەوە و دەری‌دەخا کە تەنانەت لە بازاڕی هۆنراوەی کوردیدا هۆنراوە دز هەبوە و تاقمێك لەبەر هۆی کەسی دژ بە بەرهەمی هەستیاران دەجەنگان :

**خەزنەییکە بەیتی من دوو مەصرەعم داخستووە**
**کەس طەماعی تێ نەکا ڕێگای دزم لێ بەستووە**
**بیکە بەر دیبایی نەظمم تا قیامەت نادڕێ**
**چونکە ئەفکاری مەعانی تار و پۆیی ڕستووە**
**ظاهیرا بەیتم لە نالی و کوردی زۆر کەمتر نیە**
**طالعم بەرگەشتەیە بەدبەختە بەختم نوستووە (٥٠)**

هەرچوێنێك بێت حاجی قادری کۆیی بە نواندنی ئەم بارەی ڕەخنەسازیی کوردی و هێماکردنی بۆ بەرزی هۆنراوەی نەتەوەکەی سەرئەنجامێك دەدا بەدەستەوە کە دەڵێ : لە سەردەمەکەیدا ڕێبازێکی ڕەخنەسازی ڕەسەن هێشتا لەدایك نەبوبو هۆنراوەی کوردی بە بێ لێکۆڵینەوەی زانستی بەجێ‌مابو • مێژونوسی ڕەخنەسازیش کە سەرچاوەیەکی ڕەخنەسازیی پەخشانی لە بەردەستی نەبێت هەڵبەت ئەو سەرئەنجامە بە دڵنیاییەکەوە وەرناگرێ •

ئەم هەڵوێستەش هەڵبەت مافی خۆیەتی ، بەڵام ئێمە دەتوانین بەدرێژایی

---

(٤٩) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٢٦ •
(٥٠) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشو ، ل ٦٢ •

ئەو گەشتەمان لەگەڵ هۆنراوەی چوار هەستیاری شاسواری کورد کە نزیکەی صەد ساڵی خایاند ئەم سەرئەنجامە ڕەچاوبکەین و لە کۆڕی ڕەخنەسازیی کوردیدا بیان چەسپێنین :

١ـ لە هۆنراوەی دێرینی کوردیدا دێڕگەلێك بەرچاو دەکەون ، هەرچەندە لەبەر چەند هۆیەکی زمانیی و شێوازیی و بابەتیی و دەرفەتیی ناتوانرێ بە لێکۆڵینەوەی ڕەخنەسازیی بژمێررێن و هەستیارە خاوەنەکانیان بە ڕەخنەساز لە قەڵەم بدرێن ، بەڵام گومان لەوەدا ناکرێ کە ئاوێنەیەکن بۆ ڕەنگدانەوەی چەشە و چێژی هونەریی و پێوانەی هەڵسەنگاندنی بەرهەمی وێژەیی و سەرچاوەی دەست نیشانکردنی پلەی هەستیارو چۆنیەتیی وەدەستهێنانی ڕەوانبێژیی پەسەندکراو و دەیان مەسەلەی هۆنراوەیی لەم بابەتە •

٢ـ گرنگترین بنەڕەتی ڕەخنەسازیی لەبەر تیشکی ئەو دێڕە هۆنراوانەدا سیانزە بنەڕەتن کە ئەمانەن : ( بنەڕەتی دەستنیشانکردنی سەرچاوەی هۆنراوە و بنەڕەتی مەبەست لە هۆنینەوەی هەڵبەست و بنەڕەتی ڕەگەزەکانی هۆنراوە و بنەڕەتی سەلیقە و صنعەتکاریی لە ویژەدا و بنەڕەتی تاقیکردنەوە و معاناة لە نوسینەوەی هەڵبەستدا و بنەڕەتی لایەنەکانی هۆنراوە واتە لایەنی هەستیاری داهێنەر و لایەنی بەرهەمی داهێنراو و لایەنی خوێنەر و گوێگر و بنەڕەتی هۆنینەوەی هەڵبەست بە زمانی بێگانە و بە زمانی کوردیی و بنەڕەتی بەراوردکاریی لە وێژەدا و بنەڕەتی داهێنان و خولقاندن و لاسایی نەکردنەوە و بنەڕەتی دەستنیشان کردنی ڕەوانبێژیی تایبەتیی بە زمانی کوردیی و بنەڕەتی ڕەخنەسازیی ڕەسەن و ڕەخنەسازیی نابەجیی و بنەڕەتی دزین لە وێژەدا و بنەڕەتی نەمریی هۆنراوە و هەستیار •

٣ـ ئەم بنەڕەتیە ڕەخنەسازیيانە کە لە هۆنراوەی کوردیدا هێمایان

بۆ کراوە هەرچەندە تەمەنیان سەدەی نۆزدەیەمی زایینی پۆشـیوە بە هیچ جۆرێك پەیوەندییەکی راستەوخو یان ناڕاستەوخۆ لە نێوانیان و نێوانـی ڕێبازە ڕەخنەسازییە ئەوروپییەکاندا بەدی ناکرێ لەکاتێکدا کە ساغ بۆتەوە زوربەی ئەم ڕێبازانە بەتایبەتی ڕێبازی کلاسیزمی نوێ و ڕێبازی رۆمانیـزم و ڕێبازی ڕیالیزم و ڕێبازی بەرناسیزم لە هەمان سەدەدا پەرەیان سەندووە و پێ گەیشتون •

# جۆرەکانی جێناوو دەوریان لە ڕستەی کوردیدا لە دیالێکتی کرمانجیی خواروو و کرمانجیی ژووروودا

د . کوردستان موکریانی

چی لەسەر جێناو نووسراوە ؟

جێناو ئەو بەشە ئاخافتنەیە ، کە لەنێو بەرهەمە ڕێزمانی‌یەکاندا بە زۆری لە ڕووی مۆرفۆلۆژی‌یەوە لێی کۆڵدراوەتەوە ، بەڵام لە ڕووی سینتاکسەوە ، تاکو ئێستە وەکو بابەتێکی سەربەخۆ باس نەکراوە . بەڵکو هێندێ جار هێندێ زمانەوان هەر لە بەشی ئاخافتنیشدا چەند لایەنێکی سینتاکسی‌یان ڕوون‌کردۆتەوە .

ئەو زمانەوانانەی لە ڕووی مۆرفۆلۆژی‌یەوەش لێیان کۆڵیوەتەوە زۆربەیان لەسەر جۆرەکانی جێناو ڕێك‌نەکەوتوون . بۆ وێنە مامۆستا «سەعید صیدقی» لە کتێبی ( مختصر صرف و نحو کوردی )دا (١) جێناو دابەش‌دەکاتە سەر دوو جۆر ( ١ـ متصل ، ٢ـ منفصل ) . ( متصل )یشی کردۆتە دوو بەش : ( متصل ئاشکرا و متصل شارراوە ) .

مامۆستا تۆفیق وەهبی لە کتێبی ( دەستووری زمانی کوردی )دا (٢) ئەویش وەکو نووسەرانی پێشوو هەر لە جێناوەکانی کرمانجیی خوارووی کۆڵیوەتەوە . جێناوی دابەش‌کردۆتە سەر حەوت جۆر ( بۆ ناوی کەسی سەربەخۆ و پێوە نووساو ، نیشانەیی ، لێکدەری ، موبهەم ، پرسی ، خۆیی وە ملکی ) وە هێندێ جار دەوریشیانی لە ڕستەدا ڕوون‌کردۆتەوە .

---

١ ـ سعید صدقی ، مختصر صرف ونحو کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ ، ( ٢٨ ـ ٣٣ ) .

٢ ـ تۆفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٩ ، ( ٨٢ ـ ١١٤ ) .

مامۆستا نووری عەلی ئەمین لە ( قەواعیدی زمانی کوردی ) لە صرف و نحودا (٣) باسی ئەم جێناوانە دەکا : ( جوێ ، لکاو ، هەیی ، ئیشارە وە لە کتێبی ( ڕێزمانی کوردی )دا (٤) زۆر لایەنی مۆرفۆلۆژی و سینتاکسی جێناوی ( کەسی ، لکاو ، خۆیی ، ئیشاری ، گەیەنەر ، پرسیاری ، نادیار ، هەیی ) ، ڕوونکردۆتەوە .

د. قەناتی کوردۆ لە کتێبی ( ڕێزمانی کوردی )دا (٥) ، کە دەربارەی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو ە لەم جێناوانەی کۆڵیوەتەوە : ( کەسی دۆخی ڕاستەوخۆ ، تیان ، نیشانە ، خۆیی ، پرسیار ، هەیی ، نادیار ، چەندی دیار ، وە لکاو ) باوەکو ئەم جێناوانە لە بەشی مۆرفۆلۆژیدان ، بەڵام لە زۆر باردا دۆخی سینتاکسیشی ڕوونکردۆتەوە .

د. قەناتی کوردۆ لە کتێبی ( زمانی کوردی )دا (٦) لە بەشی مۆرفۆلۆژیدا، جۆرەکانی جێناوی لە هەردوو بەشە دیالێکتە سەرەکی‌یەکانی زمانی کوردی کۆڵیوەتەوە وە دابەشی کردۆتە سەر جێناوی ( کەسی ، نیشانە ، لکاو ، پرسیاری ، هەیی ، نادیار ، دیار ، چەندی ) .

وە لەبەرهەمی ( ڕێزمانی کوردی لە دیالێکتی خواروو و ژووروودا ) (٧) د. قەناتی کوردۆ وەکو بەرهەمەکانی پێشووی لە بەشی مۆرفۆلۆژیدا زانستانە لە جێناوەکانی هەردوو دیالێکتە سەرەکی‌یەکەی کۆڵیوەتەوە وە چەند لایەنی سینتاکسیشی ڕوونکردۆتەوە. ئەم جێناوانەی کە بەر لێکۆڵینەوەکەی کەوتوون ئەمانەن : ( کەسی ، لکاو ، نیشانە ، خۆیی ، پرسیار ، هەیی ، دیار ، چەندی نادیار ، نادیار ، نەفی ) .

د. ج. خ. بەکاییف لە کتێبی ( زمانی کوردەکانی یەکێتیی سۆڤێت )دا ، کە تەنێ لە بەشە دیالێکتەکانی ناوچەی سۆڤێتی کۆڵیوەتەوە زانستانە باسی جێناو دەکا و هەر لەم بەشی مۆرفۆلۆژی‌یەیدا هێندێ جار دەوریشی لە ڕستەدا ڕوونکردۆتەوە . مامۆستا بەکاییف جێناوی دابەش‌کردۆتە سەر

---

٣ ــ نووری عەلی ئەمین ، قەواعیدی زمانی کوردی لە صەرف و نەحودا ، بەغدا ، ١٩٥٦ ، ( ٦١ ــ ٧٠ ) .

٤ ــ نووری عەلی ئەمین ، ڕێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، (٨٧ ــ ١١٠).

٥ ــ د. قەناتی کوردۆ ، ڕێزمانی کوردی ، مۆسکۆ ــ لێنینگراد ، ١٩٥٧، (١٠٤ ــ ١٢٥) .

٦ ــ د. قەناتی کوردۆ ، زمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ( ٣٠ ــ ٣٧ ) .

٧ ــ د. قەناتی کوردۆ ، ڕێزمانی کوردی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ ، (٩٩ ــ ١٢٠) .

(کەسی ، نیشانە ، هەیی ، پرسیار ، چەندی ، دیار ، نادیار ، نەفی ، خۆیی وە لکاو ) (٨) .

لە کتێبی ( دیالێکتی موکری )دا نووسەران ــ د. ك. ر. ئەیوبی و ی. ئا. سمیرنۆڤا جێناویان لەم دیالێکتەدا دابەش کردۆتە سەر ، ( کەسی ، لکاو ، نیشانە ، پرسیار ، چەندی ، هەیی ، نادیار ، دیار ، خۆیی ، نەفی ، نادیاری نیشانەیی ، یەکگرتووی خۆیی ) گەرچی ئەم جێناوانە لە بەشی مۆرفۆلۆژیدا باس‌کراون ؛ بەڵام زۆر لایەنی سینتاکسیشیان زانستانە ڕوون‌کردۆتەوە (٩) .

د. ن. مەکەنزی لە کتێبی ( لێکۆڵینەوەی دیالێکتەکانی کوردی )دا ، لە هەردو دیالێکتە سەرەکی‌یەکانی زمانی کوردی و بە هەموو بەشەکانیەوە لە بەشی مۆرفۆلۆژی‌دا زانستانە لەم جێناوانەی کۆڵیوەتەوە و ڕستەشی بۆیان هێناوەتەوە : (کەسی ، سەربەخۆ ، سۆفێکس ، نیشانە وە پرسیاری ) (١٠) .

نووسەران مێجەر ی. ب. وە سۆن س. ب. ی. لەو بەرهەمە ڕێزمانی‌یانەیاندا ، کە لە ساڵی (١٩١٩)دا ، چاپیان کردووە ، لەژێر نێوی ( سەرەتای ڕێزمانی کرمانجی )دا جێناویان دابەش‌کردۆتە سەر (کەسی ، لکاو، هەیی ، نیشانە ، پرسیاری ، گەیەنەر ، نادیار ) . ئەوەی لێرەدا شایانی باسە، نووسەرانی نێوبراو هێندێ لەو جێناوانەیان بە ئاوەڵناویش داوەتە قەڵەم (١١) .

د. جەمال نەبەز لە بەرهەمە زمانەوانی‌یەکەی (زمانی یەکگرتووی کوردی)دا زانستانە لە جێناوە کەسی‌یەکان ، جێناوی بەکارەوە نووساو وە جێناوی (خۆ)ی لە هەردوو شێوە سەرەکی‌یەکەی زمانی کوردی کۆڵیوەتەوە ، وە ئەو دۆخانەی ، کە تێیدا بەکاردێن بە بەڵگە ڕوون‌کردۆتەوە (١٢) .

---

٨ ــ د. ج.خ بەکاییێڤ ، زمانی کوردەکانی یەکێتی سۆڤێت ، مۆسکۆ ، ١٩٧٣ ، (١٣٧ ــ ١٦٦ ) .

٩ ــ د. ك. ر. ئەیوبی . و ی. ا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی موکری ، لێنینگراد، ١٩٦٨ ، ( ٤٣ ــ ٥٣ ) .

١٠ــ د. ن. مەکەنزی ، لێکۆڵینەوەی دیالێکتەکانی کوردی ، بەرگی یەك ، لەندەن ، ١٩٦١ ، (٧٣ ــ ٨٤ ، ١٧١ ــ ١٧٧ ) .

١١ــ مێجەر ی. ب. وە سۆن . س. ب. ی. ، سەرەتای ڕێزمانی کرمانجی، بەغدا ، ١٩١٩ ، ( ١٠ ــ ١٨ ) .

١٢ــ د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ ، ل ــ ٢٣ ــ ٢٧ ) .

لـه کتێبی ( ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی )دا بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی لەم جێناوانە بە شێوەیەکی تێکەڵ لەڕووی مۆرفۆلۆژییەوە کۆلدراوەتەوە (کەسی ، لکاو ، خۆیی ، لێکدەر ، هەیی ، پرسیاری) .. (١٣) .

مامۆستا مصطفی خرم دل لە بەرهەمی ڕێزمانی ( صرف دستور زبان کردی سورانی ) لە باسی ( جۆرەکانی ڕاناو )دا جێناو دابەش‌دەکاتە سەر ( ١ـ ڕاناوی کەسی جوێ ، وە ڕاناوی کەسی لکاو ، ئەوەی دووەمیان دابەش‌دەکاتە سەر ڕاناوی لکاوی بکەری ، کراوی و خستنەسەر ، ٢ ـ ڕاناوی نیشاندان ، ٣ـ ڕاناوی هاوبەشی ، ٤ـ ڕاناوی لەمەڕی یا خاوەنی ) (١٤) .

بێ لەم زمانەوانانەی ژوورەوە مامۆستایان مەسعوود محەمەد ، گیوی موکریانی و هی‌دی لە بەرهەمە زمانەوانی‌یەکانی خۆیاندا جۆرەکانی جێناویان لە ڕووی مۆرفۆلۆژی‌یەوە باس‌کردووە (١٥) .

لەم گەشتە کورتەی سەرەوەدا بەنێو بابەتی (جێناو)دا لەنێو ئەو بەرهەمە ڕێزمانی‌یانەی ، کە زمانەوانانی کوردو بیانی بۆ زمانی کوردی‌یان داناوە ، ئەوەمان بۆ ڕوون بوەوە کەوا زمانەوانان هەموویان لەسەر جۆرەکانی جێناو لە زمانی کوردی‌دا ڕێك‌نەکەوتوون . جێناویان تەنێ لە بەشی مۆرفۆلۆژیدا باسکردووە . زوربەی لایەنی مۆرفۆلۆژی‌یان ڕوون‌کردۆتەوە . هێندیکیشیان جاروبار هەر لەم بەشەدا چەند لایەنێکی سینتاکسیشیان باس‌کردووە . زۆربەی نووسەران لەنێو بەرهەمەکانیاندا جێناویان لە یەك دیالێکتدا کۆلیوەتەوە . تەنێ مامۆستایان کوردۆیێف ، جەمال نەبەز ، مەکەنزی ، وە گیوی موکریانی نەبێ ، کە هەوڵیان داوە لێکۆڵینەوەکەیان هەردوو شێوە سەرەکی‌یەکەی زمانی کوردی بگرێتەوە ، یا وەکو لە هەموو جۆرەکانی جێناو نەدوابن ، بەلاّم کارەکەیان هەنگاوێکی پیرۆزە بۆ زمانی یەکگرتووی کوردی .

ئەمانە و نەبوونی بابەتێکی سەربەخۆی سینتاکسی ، کە دەوری جێناوەکانی زمانی کوردی لە ڕستەدا لە هەردوو دیالێکتەکەدا بکۆڵێتەوە ،

---

١٣ـ ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی ، لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی سەر بە کۆڕی زانیاری کورد ، ١٩٧٦ ، (٢٧ ـ ٧٥) .

١٤ـ مصطفی خرم دل ، صرف دستور زبان کردی سورانی ؛ تبریز ، ١٣٤٧ (١٩٦٨) ، ٥٩ ، ٧٣ .

١٥ـ بڕوانە : مەسعود محەمەد ، سوورێکی خامە بە دەوری ڕاناودا ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەشی یەك ، بەغدا ، ١٩٧٤ ؛ گیوی موکریانی ، ئەلفو بێی وێنەدار بە تیپی لاتینی ، هەولێر ، ١٩٧٢ .

هانیان دام ، کە ئـەم بابەتەی ژووروو هەڵبژێرم و لـە ڕووی سینتاکسەوە لێیبکۆڵمەوە و جۆرەکانی و دەوریان لە ڕستەدا بەپێی توانا ڕوونبکەمەوە . کەرەستەی لێکۆڵینەوەشم ڕستەی هەڵبژاردووی تێکستە چاپکراوەکانی کوردی‌یە لە هەردوو دیالێکتە سەرەکی‌یەکەی کرمانجیی ژووروو و خواروودا .

## سەرەتـا

جێناو لە ڕووی ئەرکو نیشانەی ڕێزمانی و واتایەوە بەناو و ئاوەڵناو و ناوی ژمارەوە پێوەندە . زۆر جار جێگری ئەم سێ بەشەی ئاخافتن دەبێ، وەکو وان کەتەگۆری ژمارە و ڕەسەن دەردەبڕێ .

جێناو لـە ڕووی کاری ڕێزمانی‌یەوە دابەش دەکرێتە سەر ١ـ کەسی ٢ـ لکاو ٣ـ نیشانە ٤ـ پرسیاری ٥ـ چەندی ٦ـ هەیی ٧ـ خۆیی ٨ـ نادیار ٩ـ دیار ١٠ـ نا ( نەفی ) .

باوەکو هێندێ جیاوازی لەنێوان ئەم جێناوانەدا لـە هەردوو دیالێکتە سەرەکی‌یەکەدا لە ڕووی فۆنۆلۆژی‌یەوە هەبێ ، بەڵام لە ڕووی واتـا و کاری ڕێزمانی‌یەوە هەمان واتا وە لە ڕستەدا هەمان دەوری سینتاکسی دەگێڕن .

ئەم جۆرە جێناوانەی ژووروو جێناوەکانی زمانی کوردی بە دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی بە گشتی دەگرێتەوە .

گەر ئاوڕێك لـە ئیتنۆلۆژیی ئـەم جێناوانە بدەینەوە ، یەکسەر ئـەم ڕاستی‌یەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ، کەوا زۆربەی زۆری ئەم جێناوانە لە زمانە کۆنەکانی ئێرانی‌دا هەبوون وە زێتریشیان لـە هەمان بار و دۆخی ڕێزمانیدا بەکارهاتوون وە لەم جێناوانەی ئەمڕۆدا ڕەگیان ماوەتەوە ، بۆ وێنە :

من (کەسی یەکەمی تاك) لە زمانی ئاڤێستادا (مانا)یە .

ئەز ( کەسی یەکەمی تاکی دۆخی کارایی‌یە ) لە زمانی ئاڤێستادا ( ئازەم / ئازام). تو/تە (کەسی دووەمی تاك) لە زمانی ئاڤێستادا ( توڤام / توم / تو / تاڤا / تاڤە )یە .

ئەم ( کەسی یەکەمی کۆی دۆخی کارایی ) لە ئاڤێستادا ( ئاهماکەم /

---

١٦ـ بۆ ئەم بەراوردکردنە تەماشای ئەم سەرچاوانە کراوە :

س. ن. سۆکۆلۆڤ ، زمانی ئاڤێستا ، لێنینگراد ، ١٩٦٤ .

ی. م. ئۆرانسکی ، زمانە ئێرانی‌یەکان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ ، ١٤٢ ، ٥٨ ، ٤٩ ، ٥٤ .

ئاهماکام ). هی ، یی ، یا ، یێ (جێناوی هەیی) لە ئاڤێستادا (یا/هیا)یە . چ ، چی (جێناوی پرسیـاری) لە ئاڤێستادا (چاهیا)یە(١٦) ، وە دەیان جێناوی‌دی.

**(یەکەم) جێناوی کەسی :**

لە هەردوو دیالێکتە سەرەکی‌یەکەی زمانی کوردیدا ـ کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی خواروو ـ چەندین جۆرە جێناوی کەسی هەن ، وە هەر جۆرەیان دۆخی تایبەتی خۆی هەیە ، کە لە ڕێزماندا دەیگێڕن . جێناوی کەسی دیالێکتی کرمانجیی خواروو هەر یەك جۆرە ، کە لە دۆخی کارایی و خاوەنی و تیـان و سەربەخۆدا بەکاردێت .

**جێناوە کەسی‌یەکانی کرمانجیی خواروو :**

**من :** (کەسی یەکەمی تاك)
**تۆ :** (کەسی دووەمی تاك)
**ئەو :** (کەسی سێ‌یەمی تاك)
**ئێمە :** (کەسی یەکەمی کۆ)
**ئێوە :** (کەسی دووەمی کۆ)
**ئەوان :** (کەسی سێ‌یەمی کۆ)

جێناوی کەسی لە ڕستـەدا وەکو نـاو دەوری سینتاکسی دەگێڕێ ، بەتایبەتی لە دەوری بەرکاریدا ، دۆخی ڕاستەخۆ (مباشر) و تیان (غیر مباشر)ی هەیە . هەر وەکو ناویش بە هۆی پێوەندی سینتاکسی‌یەوە بە بەشەکەی پێش وە یا پاش خۆیەوە دەلکێ ، لەکاتێکدا دەوری دیـارخەرو دیارخراو دەبینێ . ڕەنگە هەر لەبەر ئەو هۆیە سینتاکسی‌یانە بێ زۆر لە زمانەوانان لە پێناسەی جێناوی کەسیدا بلێین :

( جێناو ئەو وشەیەیە ، کە جێی ناو دەگرێتەوە ، وە لەبری ئەو بەکاردێت بۆئەوەی لە ڕستەدا دووبارە نەکرێتەوە ) (١) .

ئەوەی لەم پێناسەی سەرەوەدا سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە ، کەوا وەنەبێ جێناو لە ڕستەدا بۆ ئەوە بەکاربێت ، کە (ناو) لە ڕستەدا دووپات نەبێتەوە ، بەڵکو وەکو بۆ من دەرکەوتووە ، جێناو هەر لـە دۆخی دووبارە نەکردنەوەی (ناو)دا لە ڕستەدا بەکارنایەت ، وە هەر لەبەرئەوەی جێگەی نـاو دەگرێتەوە لەم بارەدا ، بۆیـە ناوی جێناوی لێنراوە ، نەخێـر بەڵکو لەپـاڵ ئـەوەی سەرەوەشدا جێناوی کەسی وەکو بەشێکی سەربەخۆی بەشـەکانی ئاخافتن مینای (ناو) لە ڕستەدا دەور دەگێڕێ ، بۆ وێنە : جێناوی کەسی وەکو ناو لە ڕستەدا دەبێ بە نیهاد ، بەشی ناوی گوزارە ، بەرکاری ڕاستەوخۆ و تیـان ،

دیارخەر و ناوی دیارخراو . لەبەر ئەم دەورە سینتاکسی‌یانەی سەرەوەدایە ، دەڵێن جێناو لە ڕستەدا جێگەی ناو دەگرێتەوە . وەنەبێ جێگە گرتنەوەکەشی بە شێوەیەکی سەرەکی هەر لەسەر دووبارەکردنەوەی بێ لە ڕستەدا چونکە هێندێ بار هەیە ، کە ناتوانی لەبرێتی ئەو (ناو) بەکاربێنیت ، بۆ وێنە :

ئەز هاتم ، من هاتم ، منی بەختەوەر لێرەم .

لەم ڕستانەی سەرەوەدا جێناو شوێنی ناوی نەگرتۆتەوە ، بەڵکو وەکو ناو لە هەردوو ڕستەی سەرەوەدا دەوری نیهادی گێڕاوە ، وە لە ڕستەی دوواییدا دەوری ناوی دیارخراو دەبینێ‌و وەکو ناو ئامرازی سینتاکسی (ی) ، کە ئامرازی خستنە سەرە چۆتە سەری و بە وشەکەی دووای خۆیەوەی پێوەست‌و پێوەند کردووە و وشەی لێکدراوی دیارخەری سازکردووە .

جێناوی کەسی لە ڕستەدا ئەم ڕۆڵانە دەگێڕێ :

**١ــ دەبێ بە نیهاد ، وەك :**

**ئێوە** بۆ خۆتان هەموو شتێکی لە من چاتر دەزانن . (ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ١٣٢ ) .

خوشکە پەروین ، **ئێمە** هەموو شتێك دەربارەی تۆ دەزانین ( بوومەلەرزە ــ ٥٠ ) .

**من** پیری کاروان ناناسم ( ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ٧٧ ) .

**٢ــ دەبێ بە بەشی ناویی گوزارە :**

... ئاخر دڵم ماڵی تۆیە .

**٣ــ دەبێ بە بەرکاری ڕاستەوخۆ و تیان ، وەك :**

ئەویش خوا هەڵناگرێت هەتا بڵێیت **ئێمەی** خۆش‌دەوێ (لالۆ کەریم ــ ٣٥ ) .

ئەگەر نەمکەن بە سەرۆکی وەزیران ، خۆم فڕێ‌ئەدەم : ئەوسا هیچ مەترسی‌یەك بۆ **من** نابێ . (ڕەنجی کرێکار ــ ژ ــ ١ ــ ٣١ ) .

گیانە من داوای لێبوردن لە **تۆ** ئەکەم چونکە هیچ چاکەیێکم لەگەڵ **تۆدا** نەکردووە لە درۆ زیاتر . ( ژانی گەل ــ ١٣٥ ) .

٤ــ دەبێ بە دیارخەر ، وەك :

سەرنج لەو نیگا شیرین و خەندە خۆشەی **تۆ** ئەدەم . . . من (هەڵبژاردەی ڕۆژی کوردستان ) .

منیش کە سەرنجم‌دان دیم شیاوی ئەو بیرەی **ئەو** نین (عیراق ــ ١٧) .

دایکی جوامێر و جوامێریش گلەیی‌یان لێ ئەکرد ، کە بۆچی ماڵی **ئەوان** بە هی خۆی نازانێ . ( ژانی گەل ــ ٥٩ ) .

٥ــ دەوری ناوی دیارخراو دەگێڕێ :

**ئێمە**ی گەورە و لە خەم ڕەخسیو ، ئەگەر بە باشی لەم بەندانە وردبینەوە، هەر زوو ئەوەمان بــۆ دەرئەکەوێت ، کە هیچێکی ئەوتۆمان بــۆ مناڵانی کورد نەکردووە . ( پیاوە بچکۆلەکە ــ ٣ ــ ٤ ) .

زمانەوانەکان جێناوە کەســی‌یەکانی کرمانجیی ژووروویان بەپێی ئــەو دۆخانەی ، کە تێیدا بەکاردێن دابەش‌کردووەتە سەر دوو جۆر ، وە لەنێوانی ئەو دوو جۆرەدا هەر کۆمەڵە و جۆرە زاراوەیێکی بۆ بەکارهێناوە ، بۆ وێنە ، زۆربەی زمانەوانانی یەکێتی سۆڤێت گروپی یەکەمیان نێوناوە (جێناوەکانی دۆخی ڕاستەوخۆ ) وە گروپی دووەمیان نێوناوە ( جێناوەکانی دۆخی تیان ) ، بەڵام د. جەمال نەبەز گروپی یەکەمی نێــوناوە ( جێناوەکانی دۆخی کارا « حالــة الفاعل » ) ، وە دووەمینی نێــوناوە ( جێ نــاوەکانی دۆخی خاوەنی « حــالة التملك » ) (٢) .

**جۆری یەکەم :**

جێناوەکانی دۆخی کارا ( حالة الفاعل ) ئەم جێناوانەن :

**ئەز :** (بۆ کەسی یەکەمی تاك)
**تۆ :** (بۆکەسی دووەمی تاك)
**ئەو :** (بۆ کەسی سێیەمی تاك)
**ئەم :** (بۆ کەسی یەکەمی کۆ)
**هون :** (بۆ کەسی دووەمی کۆ)
**ئەو [ان] :** (بۆ کەسی سێیەمی کۆ)

ئەم جێناوانە لە ڕستەدا لەگەڵ کاری ڕانەبووردووی تێنەپەڕدا دەوری نیهاد دەگێڕن لەگەڵ :

١ ــ کاری تێپەڕی ڕانەبوردوو ، وەك :

ئەڤینی وەکی **ئەز** دزانم . . . گەمیەکە لسەر بەحرا ئێش‌و ژان (هاوکاری)٠

ب ـ کاری تێنەپەڕی ڕانەبوردوو ، وەك :

**ئەم** ژ لایێ سەربەستیا وانڤە دگەل ڕێڤەچونا ڤێ سەردەمی **بچین** ( هاوکاری ـ ٣٨١ ) .

**ئەز ناچم** دەرێ وی ناپاکی ڤە ناکم . ( دەستێ دێ ـ ٦٨ ) .

ج ـ کاری تێنەپەڕی ڕابوردوو ، وەك :

**ئەز** ژی سەر کەڤرەکی **ڕونشتبووم** . ( دەستێ دێ ـ ٧٨ ) .

جێناوەکانی دۆخی کارا وەکو لەسەرەوە پێشان‌درا ، بە شێوەیەکی گشتی لە ڕستەدا دەوری نیهاد دەگێڕن وە لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێنەپەڕ و ڕانەبوردووی تێپەڕ و تێنەپەڕدا بەکاردێن ، بەڵام هێندێ جار ، وە بەتایبەتی لە دیالێکتی کوردی سۆڤێتدا جێناوەکانی دۆخی کارا هەروەکو ناو لە زمانی کوردی‌دا لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێپەڕیش دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆی گێڕاوە ، بۆ وێنە :

(ئەوی ئەز دیتم) بەواتا ( ئەو منی دیت // دیتمی ). ( ئەز ) لێرەدا بەرکاری ڕاستەوخۆیە وە لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێپەڕدا هاتووە ( ٣ ) .

ئەم جێناوانەی ژووروو کاتێ لە ڕستەدا دەوری نیهاد دەگێڕن هێندێ جار ئامرازەکانی خستنەسەری دەچێتە سەر لەکاتێکدا ئەم ئامرازانە بەشێوەیەکی تایبەتی هەر لەگەڵ جێناوەکانی گروپی دووەم بەکاردێن ئەویش لەو دۆخەدا کە جێناوەکان دەوری دیارخەر دەگێڕن ، نەك دەوری دیارخراو . بۆ وێنە :

( **ئەوی** بێ هش کویدا چو ) ، (**ئەزی** بێچارە چ‌دکەم . ) (٤) .

## جۆری دووەم :

جێناوەکانی دۆخی خاوەنی ( حالة التملك ) ئەم جێناوانەن :

**من** : (کەسی یەکەمی تاك)
**تە** : (کەسی دووەمی تاك)
**وی** : (کەسی سێیەمی تاك بۆ ڕەسەنی نێر)
**وێ** : (کەسی سێیەمی تاك بۆ ڕەسەنی مێ)
**مە** : (کەسی سێیەمی کۆ)
**وە** : (کەسی دووەمی کۆ)
**وان** : (کەسی سێیەمی کۆ)

جێناوەکانی دۆخی خاوەنی لە ڕستەدا ئەم دەورانە دەگێڕن :

١ــ دەبن بە نیهاد :

**من** ڕند سەماکرییە ــ باڤی گۆت (دەستێ دێ ــ ٦٨ ) .

**مــە** ماڵدا هێشتن ژن و خوشك و منداڵ . (کلامێ ڕێ ــ ٣٣ ) .

٢ــ دەبن بە دیارخەر ، بەهۆی ئامرازەکانی ( ــ آ ــ ە ، ــ ی ، ــ ێ ، یێت ، ــ ێن ، ــ ێد ) خستنە سەرەوە دەخرێنە پاڵ ناوی دیارخراوەوە :

ئەزێ بمرم ، تەنێ دو کول دلێ **مندا** دچنە گورێ . (مۆرێ نەنێ ــ ٣٠) .
ڤیزەکە قەرۆ هەبو . ناڤێ **وێ** سێڤی بوو . سێڤی ــ سێڤا راست (دەستێ دێ ــ ١٧ ) .

هەرماڵەکی دخوەست بوکا **وان** ژ ڤی گوندی بە (دەستێ دێ ــ ٤٤) .

٣ــ دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆ دەگێڕێ :

ڕۆژەکی پالەی گۆتە **وی** (چیرۆکێت کرمانجی ــ ٩١) .

توزانی ، وەکی خەونێدا تە ئاڤ نەدا من . (مۆرێ نەنێ ــ ٥٥) .

٤ــ دەوری بەرکاری تیان بەهۆی ئامرازی پێوەندییەوە دەگێڕێ :

چاڤێت خۆ هەر ل **من** گەش‌کرن . (بویکا بەهدینا ــ ٨٠) .

ئەز دێ پرسیارەکێ ژ **تە** کەم ، ئەگەر تو ڕێی بدەیە من (هاوکاری ــ ٣٨١) .

٥ــ دەبێ بە بەشێك لە گوزارەی ناوی ، وەك :

ئەڤە نە بەژنا تاجدینێ **منە** ! ( شانۆگەریا لێبۆك ــ ٢٣ ) .

**سەرنج :**

ئەم جێناوانە ( **من** ، **وی** ، **مە** ، **وە** ، **وان** ) کە هی دۆخی خاوەنیی دیالێکتی کرمانجیی ژووروون هەر هەمان شێوەی لە چەند ناوچەیەکی خواروودا وەك (موکریان و سۆران) لە دووباری سینتاکسی بەکاردێن ، کە (دۆخی خاوەنی)یە لە باری خستنەسەر و بەرکاری تیـان)دا . هەروەکو چۆنیەتی بەکارهاتنی لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا .

ئەم جێناوانەی سەرەوە لە کرمانجیی خواروودا هەروەکو کرمانجیی ژووروو ئەم دوو دەورە دەگێڕن :

١ــ دیارخەر ، کە بەهۆی ئامرازی خستنە سەرەوە (ی ، ــ ە ) بەناوی دیارخراوەوە دەبەسترێ وەکو کرمانجیی ژووروو :

ئەوانە پیاوی **وی** بوون (بهرام و گلندام ــ ٤٨) .

دەیگوت : مامۆستا دەستی **منت** بەدامان (میهر و وەفا ــ ٧٣) .

ماڵی **وان** زۆر دوورە .

نازانم گوناهی **مە** چی‌یە ؟

٢ــ بەرکاری تیان ، هەروەکو کرمانجیی ژووروو بەهۆی ئامرازی پێوەندی‌یەوە دادەڕێژرێ :

دەیگوت : بەڵکو لەسایەی ویدا گولندام فیدا بە من ببەخشێ (بهرام و گلندام ــ ٤٨) .

بارام بە **وانی** کوت : (بهرام و گلندام ــ ٤٨) .

## شوێنی جێناوی کەسی لە ڕستەدا :

هەروەکو لە باسکردنی ڕۆڵەکانی جێناوی کەسی لە ڕستەدا بۆمان ڕوون بۆوە ، کەوا جێناوی کەسی کرمانجیی خوارووو وە جێناوی کەسی دۆخی کارا و دۆخی خاوەنیی کرمانجیی ژووروو بەشێوەیەکی سەرەکی دەوری نیهاد ، بەرکار (ڕاستەوخو و تیان) وە دیارخەری دەگێڕن لەبەرئەوەی ئەم بەشانەی ڕستە هەریەکەی شوێنی دیاری‌کراو و تایبەتیی خۆیان هەیە لە ڕستەدا ، جێناویش بەپێی ئەو دەورانەی دەیگێڕێ شوێنی لە ڕستەدا دەگۆڕێ ، بۆ وێنە کاتی دەوری نیهاد دەگێڕێ دەکەوێتە پێش گوزارەوە ، کە بەرکار ، چ ڕاستەوخۆ و چ تیان دەکەوێتە نێوان نیهاد و گوزارەوە ، کە دیارخەر ، دەکەوێتە دوای ناوی دیارخراو بە زۆری لەنێوان نیهاد و گوزارەدا دەبێ . گەر هاتوو وشەی لێکدراوی دیارخەری لە یەك دیارخەر زیاتری هەبوو وە ئاوەڵناو و جێناو بوون ، ئەوسا جێناوەکە لەم وشە لێکدراوە دیارخەری‌یەدا دەکەوێتە دوای ئاوەڵناکەوە یا پێشی لە کرمانجیی خوارووودا ، بەڵام لە کرمانجیی ژوورووودا هەمیشە بەپێش ئاوەڵناوەکە دەکەوێ (٥) :

برای **گەورەی من** سەربازە .

هەموو ماڵ و دارایی **منی بێ‌بەخت** هەر ئەوەندەیە .

خەبەرێ دایا **منا بەلەنگاز** بیرا من نەدچوون .

## دووەم جێناوی لکاو

جێناوی لکاو بۆ دەربڕینی دەوری کەسی و پێوەندیی وەسفی لە ڕستەدا بەکاردێت . هەمیشـــە بە وشەیەکی دی‌یەوە دەلکێنرێ ، بە واتا ســـەربەخۆ بەکارنـــایەت .

زۆربەی زمانەوانان جێناوەکانی دیالێکتی کرمانجیی خواروو لە ڕووی شێوە و بەکارهاتنی‌یەوە لە ڕستەدا دابەش دەکەنە سەر دوو بەش :

**یەکەم :** ــ م ، ــ ت ، ــ ی ، ــ مان ، ــ تان ، یان.

**دووەم :** ــ م ، ــ ی ، ــ ێ ، ــ . ــ آ ، ــ ین ، ــ ن ، ــ ن.

هێندێ لە زمانەوانان گروپی دووەم بە جێناوی لکاو و لە هەمان‌کاتدا بە کۆتایی کەسی دەدەنە قەڵەم ..وەیا بە کاری بێ‌هێز ، کاری یارمەتی‌دەر یـــان پێوەندی کاری دەژمێرن .

جێناوەکانی گرووپی دووەم جێناوی لکاو نین ، هەروا کاریش نین ، بەڵکو ئەو کۆتایی‌یانەن ، کە بەکۆتایی کاری ڕانەبووردووی تێپەڕ و تێنەپەڕ وە کاری ڕابوردووی تێنەپەڕەوە دەلکێن . لە ڕستەدا ئەو دەورە ناگێڕن ، کە ڕاناوی لکاو (ــ م ، ــ ت ، ــ ی ، ــ مان ، ــ تان ، ــ یان ) دەیگێـــڕن و دەبنـــە بەرکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ و دیارخەر . ئەرکی گروپی دووەم (ــ م ، ــ ی ، ــ ێ ، ــ / ــ . / ــ آ ، ــ ین ، ــ ن ، ــ ن) تەنیـــا نیشـــان‌دانی کەس و ژمارەیە ، نەك گێڕانی دەوری کار . ئەم کۆتایی‌یانە ، کە لەبەر ئـــەرکی ڕێزمانیی نێوی (کۆتایی کەسی) لێ‌نراوە .

کەواتە لەبەر ڕۆشنایی ئەم باسەی ژووروودا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کەوا جێناوە لکاوەکانی کرمانجیی خواروو ئەمانەن :

**ــ م :** (کەسی یەکەمی تاك)
**ــ ت :** (کەسی دووەمی تاك)
**ــ ی :** (کەسی سێ‌یەمی تاك)
**ــ مان :** (کەسی یەکەمی کۆ)
**ــ تان :** (کەسی دووەمی کۆ)
**ــ یان :** (کەسی سێ‌یەمی کۆ)

جێنـــاوە لـــکاوەکان دەچنـــەسەر جێنـــاوی ( خـــۆ ) جێنـــاوی خۆیی لێ‌دادەڕێژرێ ؛ خۆم ، خۆت ، خۆی ، خۆمان ، خۆتان ، خۆیان. هەروا ئـــەم

جێناوانە لەگەڵ ئامرازی پێوەندیش بەکاردێن و دەکەونە کۆتایی ئامرازەکەوە : بۆم ، بۆت ، بۆی ، بۆمان ، بۆتان ، بۆیان .

## دەوری جێناوی لکاو لە ڕستەدا

١ــ دەوری بەرکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەخۆ دەگێڕێ لەگەڵ کاری تێپەڕی ڕابوردوو و ڕانەبوردوودا :

**دە ــ م ــ بینێ**
**دە ــ مان ــ بینێ**
**دیت ــ م ــ ی**
**دیت ــ مان ــ ی**
**بۆم بکرە**
**بۆی بێنە**

٢ــ دەوری دیارخەر دەگێڕێ وە بەهۆی پێوەندیی لێکدەری سینتاکسییەوە بە ناوی دیارخراوەوە دەلکێ و بە شێوەیەکی گشتی واتای خاوەنی دەبەخشێ :

**کتێب ــ م ــ کڕی**
**کتێب ــ مان ــ کڕی**
**هێڤی ــ ت ــ زۆرە**
**برا ــ ی ــ مەزنە**

## جێناوی لکاوی دیالێکتی کرمانجیی ژووروو

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا یەك جێناوی لکاو هەیە ، کە ئەویش ( ــ ێ )یە ، کە بۆ کەسی سێیەمی تاك دەگەڕێتەوە ، وە لە ڕستەدا دەوری بەرکاری ناڕاستەوخۆ دەگێڕێ ، وە بە شێوەیەکی گشتی بەکارەوە دەنووسێ ، هەروا ئەم جێناوە دەچێتە سەر ئامرازی پێوەندیش : هەر مرۆڤەکی ئالایەکی ددەستی ڕاکەم و بێژمێ ( لێبۆك ــ ٣٩ ) .

لێبۆك : نوکە ؟ کا دا بچمێ ( لێبۆك ــ ١٢٧ ) .

پارە ژێ ستاندن .

## سەرنج :

ئەم جێناوە لکاوە (ــ ێ) لە کرمانجیی خوارووشدا لە هەمان بار و مەبەست بەکاردێ ، بۆ وێنە :

ئەگەر بڕۆم دەیگەمێ . بۆ لێم دووڕناکەویتەوە . ئەوەتا هەست بە ترپەی پێت ئەکەم ( بەیان ٤٧/٥٢ ) .

**(سێیەم) جێناوی نیشانە**

جێناوی نیشانە لە ڕووی واتاوە دابەشدەکرێتە سەر دوو بەش :

یەکەم : ئەو جێناوانە دەگرێتەوە ، کە واتای شت وە یا شوێنێکی نزیك دەبەخشێ ، وەك :

**ئەم ، ئەمە ، ئەمانە** لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداا .

**ئەڤ ، ئەڤا ، ئەڤانە** لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا .

دووەم : ئەو جێناوانە دەگرێتەوە ، کە واتای شت وەیا شوێنی دوور دەبەخشێ ، وەك :

**ئەو ، ئەوە ، ئەوانە** ، کە لە هەردوو دیالێکتەدا بەکاردێت .

لە ناوچەی موکریان و سۆراندا بۆ بەخشینی شوێن وەیا شوێنی دوورتر (نیشانەی هۆو ، هۆوە ، هۆوانە) بەکاردێت ، وەك : **هۆو ماڵە** .

وە لە کرمانجیی ژووروودا جێناوی نیشانەی (هان ، هانا) بۆ مەبەستی سەروو بەکاردێت ، وەك :

**ئەوێ کتێبێ نەینە ، کتێبا هان بینە .**

جێناوی نیشانە ( **ئەم ، ئەڤ ، ئەو** ) کە لەگەڵ ناو بەکاردێت ، هەمیشە بە پێشی دەکەوێ وە ناوەکە کۆتایی بە بزوێنی (ـە) دێت لە کرمانجیی خوارووداا و (ـا ) دێ لە کرمانجیی ژووروودا ، بۆ وێنە :

**ئەم گەنجە برامە .**
**ئەڤ کچا خوشکا منە .**

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ( **ئەڤ** ) وە **(ئەو)** دۆخی تیان دادەڕێژن ، کە بە هۆی پاشگری ناوی (ـی) بۆ نێر و (ـێ) بۆ مێ دەبێ : **(ئەڤی ، ئەوی)** بۆ نێر ، وە **(ئەڤێ ، ئەوێ)** بۆ مێ . زۆرجاریش بزوێنەکەی سەرەتای جێناوەکە لە نێو دەچێ و تەنیا **(ڤی ، وی)** وە ( **ڤێ ، وێ** ) دەمێننەوە . وە لە کاتی بەکارهێنانی ئەم جێناوە نیشانانە لەگەڵ ناودا یەکێتی و ڕێكکەوتنی ڕێزمانی لە بارەی ژمارە ، دۆخ وە ڕەسەنی جێناوی نیشانە و ناوەکەدا بەدیدەکرێ :

سەرهەلدانا **ڤێ** جەژنێ لجەم وان کەنگی‌یە ؟ (هاوکاری ــ ٤٨٢ ).
ئەز **ڤان** تشتا هەمیا دزانم (لیبۆك ١٣٠) .

## ڕۆڵی جێناوی نیشانە لە ڕستەدا

جێناوی نیشانە لە ڕستەدا چەندین دەور دەگێڕێ ، وەکو :

١ــ دەبێ بە نیهاد ، دەکەوێتە پێش گوزارە لە ڕستەدا :

**ئەم** ئەوەند گۆڕاوە ، لەوانەیە کاڵێی بەسەزمان خۆشی نەی‌ناسێتەوە .

**ئەمە** ماڵمــانە .

**ئەڤــە** هەنگاڤا ئێکێ‌یە ( هاوکاری ــ ٤٨٢ ) .

٢ــ دەبێ بە بەشێك لە گوزارەی ناوی‌دا :

کتێبەکە **ئەمە**یە .

٣ــ دەبێ بە بەرکار ، دەکەوێتە نێوان نیهاد و گوزارەوە : بەڵام ئایــا دوژمن **ئەمە** ئــەزانێ ؟

٤ــ دەبێ بە Adverbial ی شوێن :
بەیانی دەچم بۆ وێ ( دایك ــ ٣٦٦ ) .

( لێرەدا «وێ» وەکو «وێ» ی کرمانجیی ژووروو دارێژراوە وە دۆخــی تیــانی پێك‌هێناوە ) .

٥ ــ دەبێ بە دیارخەر .

کاتی ( **ئەم** ، **ئەو** ، **ئەڤ** ) لە ڕستەدا دەوری دیارخەر دەگێڕن ، هەمیشە دەکەونە پێش ناوی دیارخراوەوە ، وە بە هۆی پێوەندی سینتاکسی لێکدەرەوە بە ناوی دیارخراوەوە دەنووسێ ، بۆ وێنە :

**ئەم کتێبە بکرە** .

**ئەم** مرۆڤانە جڵەوی ئەقڵ و هۆش بەرەو هەمــوو شــتێ شــۆڕدەکەن ( ئەفسانەی چیای ئاگری ــ ١٣) .

**ئەڤ** کەیف و خۆشی نێزیکی مەھ و نیڤەکا ڤەدکێشن (هاوکاری ــ ٤٨٢).
جێناوەکانی (**ئەمە** ، **ئەوە** ، **ئەڤا** ، **ئەڤانا** ، **ئەمانە** وە **ئەوانە** ) کاتێ دەوری دیارخەر دەگێڕن دەکەونە دوای ناوی دیارخراوەوە ، وە بە هۆی ئامرازەکانی خستنەسەرەوە بە ناوی دیارخراوەوە لێك‌دەدرێن :

وەك میزاجی **ئەوانــەی** لێهــات ، کە ئامــانجێکی نیشــانەکراو وا لــە بەردەمیانا ، ( پاڵتۆ ـ ٣٣ ) .

**(چووارەم) جێناوی پرسیاری**

مەبەست لە جێناوی پرسیار ئەو جێناوانەن ، کە لە ڕستەدا پرسیــار لە کەس و شت و ڕووداو دەکەن .

لە زۆربەی بەرهەمە ڕێزمانی‌یەکاندا جێناوی پرسیار و ئامرازی پرسیار تێکەڵ‌کراوە ، وە هەردوو بەشی لە دەوری ڕێزمانیدا وەکو یەك تەماشا کراون.

لە دیالێکتی کرمانجیی خواروو و ژووروودا ئەم جێناوانەی پرسیــار هەن : **(کێ ، چ ، کام // کامە // کێها ، کیژان ، چۆن ، چەوا (ن) )** ، کە هەر یەکەیان دەوری تایبەتیی خۆی لە ڕستەدا دەگێڕێ .

جێناوی پرسیاری (کێ) .

مەبەست لە بەکارهێنانی لە ڕستەدا بۆ پرسیارکردنە لەو کەسەی ، کـە ڕووداوەکەی کردووە ، وە یا ئەرکەکەی کەوتۆتە سەر . لە کرمانجیی ژووروودا شێوەی (کێ) بە زۆری لە دۆخی تیان بەکاردێت وە لە دۆخی ڕاستەوخـۆدا ( کی ) زیاتر بەکاردێت .

**دەوری جێناوی پرسیاری (کێ) لە ڕستەدا :**

ا ـ دەبێ بە نیهاد ، وەك :

**کێ** دەخوێنێ ؟ **کی** دبێژە !

ب ـ دەبێ بە بەشێك لە گوزارەی ناوی ، وەك :

ئەوە کچی **کێ**یە ؟ ئەڤا ڤیزا **کێ**یە !

ج ـ دەبێ بە کاری ڕاستەوخۆ و تیان ، وەك :

تۆ **کێ** دەناسی ؟ بە**کێ** بڵێم ؟

**ئەز بۆ کی بێژم حالێ خۆ** (هاوکاری ـ ٤٨٢) .

د ـ دەبێ بە دیارخەر ، بە هۆی ئامــرازی خستنەسەرەوە بــە نــاوی دیــارخراوەوە دەنووسێ .

**نیگاری کێ بە کاریکاتۆری بکێشم** ( سێ‌نیگار ـ ١١ ) .

**تە باڤێژتە د زیندانا کێ دا ؟** (هاوکاری ـ ٤٨٢ ) .

## جێناوی پرسیـاری (چ)

پرسیاری پێ لە شت و هۆی ڕووداو دەکرێ . ئەم جێناوە لە شێوەی (چی ، چە)دا لە زمانی کوردیدا بەکاردێت .

## دەوری جێناوی پرسیاری (چ) لە ڕستەدا .

ا ــ دەبێ بە نیهاد و دەکەوێتە پێش گوزارەوە :

چ لەمە نەنگ و سووك و کرێت تر دەبێ بۆ مـن ؟ (ئەفسـانەی چیـای ئـاگری ــ ٢٢ ) .

تاجدین : چ هەیە ( شانۆگەریا لێبۆك ــ ١٣ ) .

ب ــ دەبێ بە بەشێك لە گوزارەی ناوی ، وەك :

میر : دێ باخڤن .. دێ **چی‌یە** ؟ ( شانۆگەریا لێبۆك ــ ١٤ ) .

ئەم قسانە **چین** ؟ (دایك ــ ٥٤) .

ج ــ دەبێ بە بەرکاری ڕاستەوخۆ و تیان ، وەك :

سۆفیا لە ژوورێدا دەستی بە هات و چۆکردو گوتی : ئـەو چ دەکا ؟ ( دایـك ــ ٣٢٣ ) .

چ بۆ گەردەنا مراری دارێژم ( لێبۆك ــ ٢٣ ) .

بە چ بچمە شار ؟

د ــ دەبێ بە دیارخەر ، گەر لە شێوەی (چ)دا بوو دەکەوێتە پێش نـاوی دیارخراوەوە وە بە هۆی پێوەندی لێکدەری سینتاکسی بە ناوی دیارخراوەوە دەنووسێ ، بەڵام کە لە شێوەی (چی)دا دەبێ دەکەوێتە دوای ناوی دیارخراوەوە وە بە هۆی ئامرازی خستنە سەرەوە بەوەوە دەنووسێ ، وەك :

من بە چ کارێکی سامناك هەڵساوم (فریشتەکانی سەر زەوین ــ ١٠) .

لێ ئەز ب چ ڕەنگ تاجدینی بکوژم (لیبۆك ــ ٧٠) .

ئەم زۆر بلێ‌یەش کەلکی **چی** دەگریت ( مەلای بە ناوبانگ ) .

## جێناوی پرسیاری (کام // کامە // کیها // کیهان // کیژان ) .

ئەم جێناوانەی سەرەوە هەموویان هەر یەك واتا دەبەخشن ، تەنیـا

فۆرمیان جودایە . ئەوانەش وەکو جێناوی پرسیاری **(کێ ، چ)** لە ڕستەدا هەمان دەور دەگێڕن :

ا ــ دەبن بە نیهاد وە دەکەونە پێش گوزارەوە **(کام // کامە)** . کاتێ لە ڕستەدا دەوری نیهاد دەگێڕن جێناوی لکاویان پێوە دەلکێ ، بە واتا بە تەنیا لە ڕستەدا ئەم دەورە ناگێڕن ، وەك :

**کامیان هات ؟ کامەتان ئامادەن ؟**

بەڵام **(کێها ، کێهان ، کیژان )** بێ جێناوی لکاو دەوری نیهاد دەگێڕن :

**کێها** خوشکتە ؟ **کێهان** جووانە ؟ **کیژان** هاتی‌یە ؟

ب ــ دەبن بە بەشێك لە گوزارەی ناوی ، وەك :

ماڵتـــان **کامەیـــە** ؟

ج ــ دەبن بە بەرکاری ڕاستەوخۆ و تیان و جێناوی پرسیاری **( کام // کامە )** وەکو نیهاد جێناوی لکاویان پێوە دەلکێ ، کاتێ ئەم دەورە دەگێڕن :

سەیری **کامەیان** بکەم ؟ **کامتان** پێ‌خۆشە ؟

**کێهان** دەکرێ ؟

تو **کیژان** حەزدکی ؟

د ــ دەبن بە دیارخەر

بە شێوەیەکی گشتی دەکەونە پێش ناوی دیارخراوەوە وە بە هـۆی پێوەندی لێکدەری سینتاکسی بە یەکەوە دەنووسێن :

**کام** شارت لا خۆشە ؟

**کیژان** کتێب تـە کڕی ؟

**کێهان** کتێب کڕی ؟

**کێها** ڕۆژ بوو یەکترمان ناسی ؟

جێناوی پرسیاری **( چۆن // چەوا (ن) )** .

ئەم دوو جێناوەش بۆ پرسیارکردن لە چۆنیەتیی ڕووداو لە ڕستـەدا دەکرێ . هەروا بۆ زانینی چۆنیەتی شتیش لە ڕستەدا بەکاردێت .

**دەوری جێناوی پرسیاریی (چۆن // چەوا (ن)) .**

ا ــ دەبێ بە Adverbial ی چۆنیەتی ، وەك :

**چۆن** هاتی ؟ **چەوا** ڕەڤین ( لێبۆك ــ ٧٢ ) .

ب ــ دەبن بە دیارخەر و دەکەونە دوای نـاوی دیارخراوەوە ، وە بـە هۆی ئامرازی خستنەسەرەوە بە یەکەوە پێوەست دەبن :

کاری **چۆنت** دەوێ ؟

ج ــ بە بەشێك لە گوزارە :

تەندروستیت **چۆنــە** ؟

ما تو وی نایناسی یێ **چەوایە** ؟ ( لێبۆك ــ ١٦ ) .

جێناوی **((چەند))** لە زمانی کوردیدا وەکو جێناوی پرسیاری و جێناوی چەندی بەکاردێت ، وە لە ڕستەدا چەندین دەوری گرنگی ڕێزمانی دەگێــڕێ ، بــۆ وێنــە :

ا ــ دەبێ بە نیهاد :

**چەنــد** هــاتن ؟

ب ــ دەبێ بە دیارخەر و دەکەوێتە پێش ناوی دیارخراوەوە :

**چەندکەس** لێرە بــوون ؟

**چەند** ڕۆژێك بە گەرمەوە شەڕکرا ( زاری کرمانجی ــ ٥ ) .

**چەند** مەها لجنیڤا ئو ڤیەنا ژی خۆ دەرمانکر . (ڕۆژی کوردستان) .

ج ــ دەبێ بە بەشێك لە گوزارە :

تەمەنت **چەندە** ؟

**(پێنجەم) جێناوی چەندی (چەندێتی)**

ئەم جێناوە واتای چەندێتی و پرسیار دەبەخشێ ، (چەند) هەروەکـو لە جێناوی پرسیاریدا باسکرا ، یەکێك لەو جێنـاوانەی بـە شێوەیــەکی سەرەکی ئەم دوو واتایە دەگەیەنێت .

کاتێ جێناو (چەند) واتای چەندێتی دەبەخشێ لە ڕستەدا دەبێ بە :

ا ــ بەرکاری ڕاستەوخۆ و واتای پرسیاریش دەبەخشێ ، وەك :

**چەندت** خوارد ؟

ب ـ دەبێ بە Adverbial چۆنیەتی :

سەرپۆلیس **چەند** توندی لێدا ( دایك ـ ٣٦٥ ) .

ج ـ دەبێ بە دیارخەر ، واتای پرسیاریش دەگەیەنێت :

**چەند**کیژ و کورەك هەر ئێك هێکەکێ دێ داننە عەردی (هاوکاری ـ ٤٨٢).

بێ لە جێناوی (چەند) ، کە لە هەردوو دیالێکتە سەرەکی‌یەکەدا هەیە ـ کرمانجیی خواروو و ژووروو ـ جێناوی دیش هەن ، کە واتای چەندێتی دەبەخشن ، بەڵام کەمتر بەکاردێن ، وەك :

**ئەوەندە ، هێندە** لە کرمانجیی خواروودا ، **چقاس ، ئەڤقاس ، ئەوقاس** لە کرمانجیی ژووروودا ، بۆ وێنە :

هەر **ئەوەندە** هەلم دەستکەوت (بوومە لەرزە ـ ٦٥) .

**ئەوقاس** ڕوون دیزەدا جی نابە (زمانی کوردی سۆڤیەتی ـ ١٥٨) .

لە کرمانجیی ژووروودا جێناوی چەندی **(چەند ، چقاس)** ، کاتێ دەوری دیارخەر دەگێڕن هێندێ جار دەکەونە دوای ناوی دیارخراوەوە ، وە بە هۆی ئامرازی خستنەسەرەوە بە یەکەوە لێکدەدرێن (تەماشـای زمانی کوردەکانی سۆڤیەت ، د. ج. باکاییڤ ، ل ، ١٥٨ بکە ) .

نایێ بیرا من ، من ناڤێ **چەندا** نقیسی‌یە .

ئەزێ **ئەڤقاسا** ژ کوی دەستخەم .

**(شەشەم) جێناوی هەیی**

لە هەردوو دیالێکتە سەرەکی‌یەکەی زمانی کوردی‌دا چەند جێناوێکی **(هەیی)** مان هەیە ، کە لە ڕستەدا . واتای هەبوون دەبەخشێ . ئەم جێناوانەی هەیی **(ـ هی ، ـ ی ، ـ ێ)** لە کرمانجیی‌خواروودا ، وە **(ـ یا ،ـ یێ ، ـیێ / یە / ینە )** لە کرمانجیی ژووروودا لە ڕستەدا بە پێش ناو ، جێنـاوی کەسی ، جێناوی پرسیاری ، جێناوی خۆیی وە ئاوەڵناو دەکەوێ .

جێناوی هەیی لە کرمانجیی ژووروودا ڕەسەن‌و ژمارەی ناوی دیارخراو پێشان دەدەن ، بەڵام لە کرمانجی خواروودا ئەم دەورە نـاگێڕن ، تەنیـا لـە هەندێ زارۆچکەدا نەبێ **(ێ)** بۆ ناوی مێ بەکاردێت .

ئامرازەکانی خستنەسەری زمانی کوردی لە جێناوی هەیی وەرگیراوە لە

کرمانجیی خوارووودا (ـ ی) لە (هی) وەرگیراوە ، وە لە کرمانجیی ژووروودا (ـ آ ) لە (یا) وە (ـ ێ) لە (یێ) ... دارێژراوە .

کاتێ جێناوی هەیی لە وشەی لێکدراوی دیارخەریدا بەکاردێت وەکو ئامرازەکانی خستنەسەر واتای خاوەنی و خستنەسەر دەگەیەنێت . وە بە زۆری ناوی دیارخراو لە ڕستەدا نابێ ، بۆ وێنە :

**هی** سپی دەکرم .

لێبۆك : گەلی برا دا **یێت** دی ژی هشیارکەین ( لێبۆك ـ ۱۰۲ ) .

ئەو ناوە دیارخراوەی ، کە لە ڕستەدا نابێ لەوانـەیە دەوری نیهـاد ، بەرکار ، بەشێك لە گوزارە بگێڕێ ، بۆ وێنە :

ا ـ دەوری نیهاد :

**یێ** کار دکا برچی نامین (پەندی کوردی) .

ب ـ دەوری بەرکار :

**هی** کێ هەڵبژێرم .

ج ـ دەبێ بە بەشێك لە گوزارە :

ئەوە **هی** خۆمـانە .

**( حەوتەم ) جێناوی خۆیی**

**« خۆ »** لەگەڵ جێناوانی لکاو **(ـم ، ـ ت ، ـ ی ، ـ مان ، ـ تان ، یان)** شێوەی جێناوی خویی پێكدێنن بەم جۆرە :

**خۆ + م = خۆم** (کەسی یەکەمی تاك)
**خۆ + ت = خۆت** (کەسی دووەمی تاك)
**خۆ + ی = خۆی** (کەسی سێیەمی تاك)
**خۆ + مان = خۆمان** (کەسی یەمی کۆ)
**خۆ + تان = خۆتان** (کەسی دووەمی کۆ)
**خۆ + یان = خۆیان** (کەسی سێیەمی کۆ)

بەڵام لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا هەر شێوەی **(خۆ // خوە)** لەگەڵ کەسی تاك و کۆ بێ لێکدانیان لەگەڵ جێناوی لکاو ، کە لە کرمانجیی ژووروودا نییە . وە لە هەردوو دیالێکتدا واتای خاوەنی ، هەیی دەبەخشێ ، وە هەروا لە هەردوو دیالێکتدا ڕەسەن و دۆخ نانوێنێ وە لە کرمانجیی ژووروودا هەریەك باری هەیە بۆ تاك و کۆ .

جێناوی خۆیی لە ڕستەدا دەبێ بە :

١ــ نیهاد ، وەك :

**خۆم** خاوەن دەسەڵاتم (دایك ــ ٣٧٥) .

وام ئەزانی بە تاقی تەنیا **خۆم** و کاڵێ هەین لە دنیادا .

٢ــ بەرکاری ڕاستەوخۆ و تیان ، وەك :

وەك چۆلەکەی سەرما بردوو خۆی دەهاوێتە کۆشمەوە (بەیان ــ ٤٥/٣٤).

ئەزا هاتیم تە بۆ **خۆ** بڕەڤینم ( لێبۆك ــ ٦ ) .

٣ــ دیارخەر ، دەکەوێتە دوای ناوی دیارخراوەوە وەکو جێناوی کەسی وە بە هۆی ئامرازی خستنەسەرەوە لە گەڵیدا لێك دەدرێن ، وەك :

شیرین سەری **خۆی** داخست و چووە بنەبانی ژوورەکە (بوومەلەرزە) .

هیچ کەس بە زۆر بۆ لای **خۆیان** ڕاناکێشن (دایك ــ ٣٧٥) .

دەستێ دەیکا **خۆ** ماچ دکر (هاوکاری ــ ٤٨٢) .

٤ــ دەبێ بە بەشێك لە گوزارە :

بە تۆ چی ئێرە ماڵی **خۆمە** .

**(هەشتەم) جێناوی نادیار**

ئەو جێناوانەی ، کە چەندێتی ، ژمارە ، وە کەس نیشان نادەن ، **(یەکێك ، کەسێك ، هێندێك ، گەلێك ، شتێك ، فلانکەس ، فلانشت)** لە کرمانجیی خوارووداا بەر ئەم جێناوە دەکەوون . زۆر جار شێوەی ئەم جێناوانەی سەرەوە کورت‌تر دەکرێ ، ئەویش بە تەلەفوزنەکردنی **(ــ ك)** لە کۆتایی وشەکەدا ، بۆ وێنە دەڵێن : یەکێ ، کەسێ ، هێندێ ... هەتا لە تێکستی وێژەییشدا زۆر بەرچاودەکەوێ .

لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ئەم جێناوە نادیارانە بەدیدەکرێن :

**کەس // کەسەك // توکەس ، تشت // تشتەك // توتشت ، هنەك // هندەك .**

**دەوری جێناوی نادیار لە ڕستەدا**

١ ــ گرنگترین دەورێ ئەم جێناوانە لە ڕستەدا دەیگێڕن ، دەوری

دیارخەرە ، کە بە تایبەتی جێناوی هێندێك و گەلێك دەیگێڕن ، هەمیشەش دەکەونە پێش ناوی دیارخراوەوە، وە بە هۆی پێوەندی لێکدەری سینتاکسییەوە بە یەکەوە لێكدەدرێن ، بۆ وێنە :

دەرگا تەنەکەکەی ژوورە قوڕینەکەم کردەوە تاکو **هەندێ** هەوای پاك هەڵمژم (بوومەلەرزە ـ ٨٢) .

خزمەتا **هنەك** مرۆڤ و رێبەرێد ئایینێ ئێزدیان ناهینە ونداکرن .

نووسەر لە **گەلێك** ڕووداوانی ئەم سەردەمەی کۆڵیوەتەوە .

ئەم دێ **گەلەك** ئالوزیا و نەخوشیا بینین ( لێبۆك ـ ٤٣ ) .

**هندەك** چەکدار بەردکەڤن ، ستێێ دگرن و دئیننە خوارێ (لێبۆك ـ ٣٣).

ب ـ دەبن بە نیهاد :

دڤێت **هندەك** دکونجێت تاریڕا ببنە قوربان دا رۆژ زوتر بهەلێت ( لێبۆك ـ ٤٧ ) .

**یەکێك** بەرەو لادێ دێ .

ج ـ دەبن بە بەرکار :

تو **تشتەکی** دزانی ؟ ( لێبۆك ـ ١٣ ) .

## ( نۆیەم ) جێناوی دیار

لە زمانی کوردیدا چەندین جێناومان هەیە ، کە واتای دیار دەبەخشن ، وەك : **(هەر ، هەرکەس ، هەرشت ، گشت ، هەموو ، هەمووشت ، هەمووکەس)** لە کرمانجیی خوارووا ، وە **(هەر ، هەرتشت ، هەرکەس ، گشت // گشك ، هەمی ، هەمیتشت، هەمیکەس ..)** لە کرمانجیی ژووروودا .

## دەوری جێناوی دیار لە ڕستەدا

ئەم جێناوانە لە ڕستەدا چەندین دەور دەگێڕن ، کە لە هەموان زیاتر دەوری دیارخەرە ، کە دەکەونە پێشناوی دیارخراوەوە ، وە بە هۆی پێوەندی لێکدەری سینتاکسییەوە پێوە دەبەسترێ .

ا ـ دەبن بە دیارخەر :

ڕاڤەکردنی **هەموو** مەتەڵەکان بەم چەشنە بە پێویست نازانم (فۆلکلۆری هۆنراوەکانی کوردی ) .

**هەر** بۆنێك دەمارێك دەهێنێتە جووڵە (هەتاو ــ ٥٠) .

هەمی ریکیت خاندنو زانینێ لبەر هاتبوونە دایخستن ( نووسەری کورد) .

ب ــ دەبن بــە نیهــاد :

**هەموو** بۆ دیتنی ئەسپەکە هاتبوون (ئەفسانەی چیای ئاگری) .

بلا **هەمی‌کەس** ببێژن زینێ سەرێ خۆ ب ڕوندکێت مەمۆی شوشــت ( لێبــۆك ــ ٣٨ ) .

ج ــ دەبن بــە بەرکار :

چی لە دڵ و مێشك بوایە **هەمووی** پێ‌ئاشکرا دەکرد ( سێ‌نیگار ــ ١١) .

مەم : بلا دڤێت **هەرتشتەکی** بکەین ( لێبۆك ــ ٣٦) .

**( دەیەم ) جێ ناوی نا ( نەفی ) .**

جێ‌ناوی **(هیچ ، هیچ‌کەس ، هیچ‌شت ، چ)** لە کرمانجیی خواروودا وە **(هیچ // هەچ // چ ، )** لە کرمانجیی ژووروودا دەوری جێ‌ناوی نا ( نەفی ) دەگێڕن . هەرچ ڕستەیەکی ئەم جێ‌ناوانەی تێدابێت کارەکەی لە دۆخی نــا (نەفی)دا دەبێ ، بۆ وێنە :

ورتە لە **هیچ** لایەکەوە نەئەهات (١٠ ــ چیرۆك) .

میر کوتی : ئەی **کەسێکی** دنیا لە تۆ چۆڵە ، **هیچ** ئاگات لە خۆ نیە (میهرو وەفا ــ ١٠٥ ) .

لنك تە **چ** نینە هەکە تژی کۆلانا برسی بوون ( لێبۆك ــ ١٣١ ) .

دەوری جێ‌ناوی **(نا)** لەڕستەدا :

ا ــ دەبێ بە بەرکاری ڕاستەوخۆ و تیان ، وەك :

**هیچ‌کەس** بە زۆر بۆلای خۆیان ڕاناکێشن ( دایك ــ ٣٧٥ ) .

بە قوربانتان بم ، بەخوا ئاگام لە **هیچ** شتێك نی‌یە (بوومەلەرزە ــ ٤٥ ) .

لنك تە **چ** نینە هەکە ڤیان بمریت (لێبۆك ــ ١٣١) .

ب ــ دەبێ بە دیارخەر و دەکەوێتە پێش ناوی دیارخراوەوە ، وە بە هۆی پێوەندی لێکدەری سینتاکسی‌یەوە لێك‌دەدرێن :

ئەگەر ئەو خاڵە ببینم **هیچ** خەمم ئیدی لەو دونیایەدا نییە (مهرو وفا ـ ١٠٤ ) .

ئەم قسانە چ پەیوەندێکی بە قسەکانی خۆمانەوە نەبوو (بوومەلەرزە) .

ج ـ دەبێ بە بەشێك لەگوزارە .

**هەمو** ئەو چاکانەی لە لا هیچە .

## ئەنجـام

لە زمانی کوردیدا بە گشتی وە لە هەردوو دیالێکتە سەرەکی‌یەکەی‌دا بـە تایبەتی دە جۆرە جێناومان هەیە ، کە بریتین لە (جێناوی کەسی ، لکاو ، نیشانە ، پرسیاری ، چەندی ، خۆیی ، هەیی ، نادیار ، دیار ، نا ( نەفی ))ـ.

ئەم وشانەی ، کە بەر ئەم جێناوانە دەکەون ، لە هەردوو شێوەکەدا بـە شێوەیەکی گشتی وەکو یەك وان ، کە تاکە جیاوازی‌یەکی لە نێواندا هەبێ هەر لە جێناوە کەسی و لکاوەکاندایە .

لە کرمانجیی خوارووا تەنیا یەك جۆرە جێناوی کەسیمان بۆ دۆخـی خاوەنی و دۆخی کارایی هەیە ، بەڵام لە کرمانجیی ژووروودا بۆ هەر دۆخەی جێناوی کەسی تایبەتی خۆی هەیە .

جێناوەلکاوەکانی کرمانجیی خواروو لە کرمانجیی ژووروودا بەدی‌ناکرێن، بەڵکو تاکە جێناوێکی لکاومان هەیە ، کە ئەویش ( ـ ێ )یە .

لە هەردوو شێوەکەدا لە ڕووی فۆنۆلۆژی‌یەوە جیاوازییان هەیە ، بەڵام بۆ هەمان واتاو دەوری ڕێزمانی بە کاردین ، وەکو : **هەموو // هەمی ، هیچ //**

**هەچ // چ ، گشت // گشك ، کیهان // کیژان ، ئەم // ئەڤ .**
جێناوەکانی هەردوو شێوەکە لە ڕستەدا هەمان دەوری سینتاکسـی دەگێـڕن .

ئەم جێناوانە لە ڕستەدا دەوری نیهاد دەگێڕن : کەسی ، لکاو ، نیشانە ، پرسیاری ، خویی ، هەیی، ، نادیار وە دیار .

لە دەوری بەرکاردا جێناوەکان بریتین لە : کەسێ ، لکاو ، نیشانە ، چەندێتی ، پرسیاری ، هەیی ، خۆیی ، نادیار ، دیار ، وە نا .

جێناوی کەسی ، لکاو ، نیشانە ، پرسیاری ، چەندێتی ، خۆیی ، نادیار، دیار وە نا لە ڕستەدا دەوری دیارخەر دەگێڕن .

هەندێك لەم جێناوانە دەبنە بەشـێك لەگوزارە : کەسی ، نیشـانە ، پرسیاری ، هەیی ، خۆیی ، وە نا .

جێناوی نیشانە و چەندێتی دەوری Adverbial یـش دەگێـڕن لـە ڕستـەدا .

ئەم جێناوانەی دەوری نیهاد دەگێڕن لە ڕستەدا دەکەونە پێش گوزارەوە. ئەوانەی بەرکارن دەکەونە نێوان نیهاد و گوزارە .

ئەو جێناوانـەی ، کە دیـارخەرن گەر بـە هـۆی پێوەنـدی لێـکدەری سینتـاکسییەوە لەگەڵ نـاوی دیـارخراو لێکدرابن ئەوە دەکەونە پێش ناوی دیارخراوەوە . گەر بە هۆی ئامرازی خستنەسـەرەوە وشـەی لێـکدراوی دیارخەری پێك بێنین ، ئەوە دەکەونە دوای ناوی دیارخراوەوە .

وشەی لێکدراوی دیارخەریش بەشێوەیەکی گشتی دەکەوێتـە نێـوان نیهاد و گوزارەوە .

ئەوجی ناوانەی دەوری Adverbial دەگێڕن بە شێوەیەکی گشتی دەکەونە سەرەتای وەیا کۆتایی ڕستەوە .

# جەلادەت بەدرخان

صادق بهاءالدین ئامێدی

ئەمر جەلادەت بەدرخان ژ هەلکەڤتی و فێهرسێت بێ بەڤل یێت ملەتێ کوردە د سەدێ بیستێ زاینیدا ؛ ئەمــازە د بزاڤ و خەباتا خورت و دژوار یاکو وی دکر ژ بو ڤەبراندنا نەزانینێ ب رێکا بەلاڤکرنا زانینێ • بەهەشتی ژ هزرکەر و خەمخورێت دەستــەکا پێشی (بەری) و ژ رێڤــە بویــە یــاکو پاشڤەمان و پاشکەڤتنا ملەتێ کورد د هەمی لایێت ژین و ژیــارێ ددانــە بال نەزانینێ ؛ ئانکو پێڤە بەند دکرن • ژبەر هندێ بنەمالا بەدرخانی ژ کورد پەوەرێت پێشی بویــە ، کو بــەرێ بنیــاتی یێ بەلاڤکرنا زانینێ ، ب ستویێ خو ڤەگرتی و سەرکێشیێ وان «مقداد مدحت» کورێ مامێ وی ئانــکو پسمامێ وی بویە ؛ ئو پاشی وی ژی عبدالرحمن بەدرخان بو ، رۆژنامــا «کوردستان» ل سالا (١٨٩٨ ــ ١٩٠٢)ێ ل وەلاتێ «مصر»ێ چاپ دکر و بەلاڤ دکر • پاشی وی ژی ، برایێ جەلادەت بەدرخانی یێ مەزن ثریــا بەدرخانی ، جڤاتا خویبون دگەل هەڤالا دگێرا و تڤستا بەرکەڤتی و گران بها ب ناڤێ «القضية الكردية» ب ناڤێ دکتور بلەچ شێرکو ب زمانێ فرەنسی دانا و « ئەمر محمد علی عونی » ل دوی گۆتنا سەیدایێ مەزن «عمر وجدی» شێخێ رەواقا کوردان ل زانینگەها ئەزهەرێ د بەرێدا ژ فرەنسی وەرگێرا زمانێ عەرەبی و ل چاپخانا «السعادة» ل مصرێ سالا (١٩٣٠)ێ چاپکر •

بەهەشتی ژ زانایێت کورد بیێت ئێکجار ژێهاتی و ژ بەر خو دەرکەڤتی و دلسۆژ بویە د روشەنبیری‌یا گشکی‌دا و پوسپور و شەهرەزا بویە د کولتورێ کوردی‌دا ، نەمازە زمانڤانییێ ئانکو لێنگویستیکی ، تورڤانی و قانوینیێ‌دا ؛ ژبەرکو چەند بیژی دەستهاتی و مەلەڤان بویە د ڤان زمانێت جیهانی‌دا : فرەنسی ، ئەلمانی ، روسی و یونانی کو بنگەهێ روشەنبیری‌یا ئۆروپی‌یە ، ژبلی دەستهاتنا وی د زمانێ فارسی ، تورکی و عەرەبی و د مەزنی‌یا خودا پاشی چل سالیێ هوی زمانێ ئنگلیزی ببو ، پێ تاخڤت (دئاخڤت) و پێ دنڤیسی ٠

گرۆڤێ ژێهاتن و پوسپوری‌یا وی ژی نڤشت و گۆتارێت وی‌نە ، بیێت د کۆڤارا « هاوار Hawar و روناهیێ Ronahi )) دا ل سەرێك بەلاڤ دکرن ب ناڤێ خو یێ درست و چەند ناڤێت جودا و نەپەن کو لایێت روشەنبیری ژ زمان و فولکلور ، دویرۆك و جوگرافییێ بون ٠

نەمر جەلادەت کورێ ئەمین عالی‌یە ٠ عالی نیشانا ناڤێ بابێ وی‌یە ، کوری بەدرخانی‌یە ، میرێ دویماهییێ یێ وەلاتێ بۆتان ٠ بابێ وی میر عالی ژ شەش کورێت بەدرخانی‌یە ، ئەویت کو فامیلیا بابێ خو ئانکو بنەمالا خو ب خوڤە گرتی کو سەخبێرا وێ بکەن ، چاڤێ خو بدەنێ داکو سەرێ وێ د ناڤ ملەتێ کورددا هەرێ بلند بیت ؛ ب رێکا بزاڤ و خەباتا کوردپەروەریێ، هەتا کو کورد د گەهتە ئارمانجێت خو وەکی هەمی ملەتان دبەرهەڤکرنا ژین و ژیارەکا سەرفەراز و سەربلند ٠

دەیکا وی ناڤێ وێ ( سنیحة ) بو ٠ ژ تەخەرێ چەرکەسان بو ٠ بەلێ ب درستی هوی (فێری) زمانێ کوردی ببو ، ب رەهوانی دگەل کورێت خو و کچا خو پێ ئاخڤتی‌یە و پێ ژی خوری‌یە کو زمانێ باب و باپیرێت هەڤگیانێ وێ یە ٠

بابێ وی پاشی چۆیه ستامبولێ (سنیحه) ب سەر ژنا خو یا بەرێ ئینایه ئو نەخریێ وێ نەمر جەلادەت بویه ، ل سەرێ نیسانا سالا (١٨٩٣)ێ ژێ بویــه •

هندی بابێ وی ئەمین عالی ، مرۆڤەکێ دەستهاتی و حال خۆش بویه • زانا و کوردپەروەر و خویندەڤانەکێ ژێهاتی بویه ئەمــازە د قــانوینێدا و هۆزاڤان ژی بویه • ژبەر هندێ ئەمر جــەلادەت ل مــالەکا زەنــگین و خویندەڤان ژییه و باش هاتیه پەروەردەکرن و خودانکرن ، خاسما بابێ وی دبەرراچۆیه ، باش چاڤێ خودایێ و هنارتیه خویندنگەهان • وی ب خــو ژی ل مال هوی گەلەك لایێت پێتڤی ئەمازە زمانێ کوردی و کوردپەروەر کرییه • بەلێ پا ل درەك و باژێرەکی دەمەکێ درێژ نەمایه ؛ ژبەرکو بابێ وی ئەمین عالی حاکم جزا بویه • هەر هەیامەکی ل باژێرەکی بویه ژ باژێرێت دەولەتا عوسمانی یا مەزن و بەردڕیای ؛ یاکو پێترینی وەلاتێت روژهەلاتــا ناڤین و ناڤەراست دبن فەرمانداریا وێ ڤەبون • ژبەر هندێ ل خویندنگەهێت گەلەك باژێرا خویندیه ، وەکی عەکا ، نابلس ، ســەلانیك و ئەدرنه ، هەتا قۆناغا خویندنا سەرتایی ب دویماهی ئینایه •

د شەڕێ یەکێ جیهانی هەڤپشکی کرییه ، بەر پرسیارێ خــۆراك و جەبلخانێ بویه • ژبەر هندێ دگەل لەشکری بویه ژ وەلاتەك و جهــەکی چۆیه ئێکی دی ، هەتا خو چۆیه باژێرێ «باکو» ل ئێکەتیا سوڤێتی • ژبەر هندێ خویندنا وی یا ژ ڕێڤه یا ئالۆز و بێ سەر و بەر بویه ، ژبەر ڤەگوهازتنا ل سەرێك و جەنگێ جیهان ب ئالوزی ، تەنگاڤی و گرفتاریی یێت خوڤه •

بەلێ زمانێ فارسی ، فرەنسی ، روسی و یونانی ل دوی گۆتنا کابانییا وی رەوشەن خانێ ل مالا بابێ بویه ، ل نك سەیدایێت خومالی خویندیــه • زمانێ تورکی و عەرەبی ل خویندنگەهان ب دەرس خویندن هــوی بویــه • ئەڤه ژ بلی بابەتێت دی ب زمانێ تورکی یان ژی عەرەبی • زمانێ ئەلمانی ل

ئەلمانیای هوی بویە ؛ دەمێ ئەو و برایێ خو د • کامیران ژ بنێ گوهی چۆینە ئەلمانیای ب مشەختی ؛ دا ژ سیاسەتا تورانی یا ئەتاتورکی دویر بن •

بەهەشتی نە د بچویکنی نەژی د زرکورەیی و تۆلازی‌یا خو ل وەلاتێ باب و باپیران ل جزیرا بۆتان نەبۆراندیە • بەلێ پا دبن ئەموزگاری و شیرەتێت بابێ و کەس و کارێت بنەمالی‌ڤە بویە ، کو هەرتم کورد و کوردستان ل سەر زار و هزر و بیرێت وان بویە • ژبەر هندێ ئەڤینا ملەتێ کورد و وەلاتی د خوین و دەمارێت وی‌دا جهێ خو کربو چەسپی‌بو • ژبەر وێ یەکێ بەهەشتی ئەڤیندارەکێ ئێکجار دل و هناڤ کوزری یێ کورد و کوردستان و زمان و تۆرێ کوردی بویە • ئەڤ ئەڤینداری یا وەسا ژ کەل و ژ دل ژی ، هەر وەکی دیارە ژ دویربوینی‌یا وی بویە ژ وەلاتێ باب و باپیران و ژ بێ خودانی و بێ سەمیانی‌یا ملەتێ کورد یێ د سخنتی ل دوی سخنتیێ ، تەنگاڤی ل دوی تەنگاڤیێ‌دا دژی ، تەرا بەرا و بەلەنگاز ، ل ڤی وەلاتی و وەلاتێ ب رەخڤە ژین و ژیارەکا بێ رویمەت و سەر شور دژی •

بەهەشتی هەر ژ رۆژا ژ دایێ بوینیێ ل ستەمبولێ سالا (١٨٩٣)ێ و هەتا کو ب ناڤسال ڤەچۆیی و مەزن بوی و چۆیە بەر دلۆڤانی‌یا خودێ ؛ دەمەکێ گەلەکێ کورت ل وەلاتێ باب و باپیران ژی‌یە ئەو ژی د چەند دەلیڤە و دەرفەتاندا بویە •

١ــ سالا (١٩١٩)ێ بەهەشتی و نەمر د• کامیران بەدرخان دگەل ئەکرەمێ جەمیلی یێ خەلکێ دیابەکرێ د گەل مێجەر نوئێلی ، ژ باژێرێ ستامبولێ بەر کوردستانێ‌ڤە دچۆن ژبو دیتن و زانینا دارخازێت ملەتێ کورد کانێ چنە بەری پەیمانا (سیڤر) ل ناڤبەرا هەڤالبەندان و دەولەتا عوسمانی بێتە بەستن و موهرکرن • پاشی هەر چار چوین و ڤەگەریاین بیر و باوەرێت وان زانین نڤیسین ئێك ژ وان بیر و ران ئەڤەبو : هەکە هات و ئەم دەستی ژ

کوردان بەردەین و خو پێ هاینەدەین ، کورد ب خو دێ شێن تورکا ژ وەلاتێ خو دەربێخن [1] •

٢ــ ژ زار دەڤێ هەڤالێ هێژا صبری احمد بوتانی رۆژا (١٩٧٩/٢/٢٧)ێ ل بەغدا ، صەبری گۆت : د ناڤبەرا سالا (١٩٣٥ ــ ١٩٣٨)ێ بەهەشتی جەلادەت بەدرخان دهاتە ( ئەندیوەرێ ) ل مالا رەحمەتی عبدالکریم ئەفەندی سەرەکی باژێرڤانیێ (بەلەدیێ) ، چەند جارا بەهەشتی هاتبا وێرێ دچو راسەرێ جزیرا بۆتا • ئەو جهێ بلند و هەلکەفتی ل هنداڤ جزیرێ و دەشتا وێ یا روبیارێ دجلەی تێرا دچیت • جارەکێ ئەز ئانکو صبری احمد بوتانی دگەل زاروکا ل پەی (دوی) جەلادەتی و عبدالکریم ئەفەندی دچۆم ؛ من دیت کو بەهەشتی ب دوربینێ بەرێ خو ددا باژێرێ جزیرێ ، جهێ باب و باپیرا و دگۆت : « وا هەیە تاخا «میر عەلییا » • وا هەنێیە «برجا بەلەك» ژی دیارە • «مزگەڤتا سور» ژی ئەز باش دبینم • دوربینا من گەلەك روهن و زەلالە هەتا کو نەخش و نیگارێن سەر پارچێن پرا ( بافد Bafid ) دده خویاکرن • ژخوە چیایێ جودی تێتە بەر پوزا ( دفنا ) من • پاشی گۆت: « هەر چەند ئەز هنگی زرکورەبوم لێ دیسا باش تێتە بیرا من ، ئەز باش پێ دحەسیام کا چاوا نەمر جەلادەتێ رەحمەتی جار روی گەش دبو ئانکو دبشکوری و دەڤ ب کەنی بو ؛ جار ژی دتنگژی ، پوسیدە دبو دبوغومی و دغەیدی ؛ ناڤ چاڤ لێ دبون گرێ ؛ بەرێ دوربینا خو راست و چەپ وەردگێرا • چەمێ جوهیا پرا ( بافد Bafid ) و چیایێ جودی و دو سێ جارا ل دوی ئێك دگۆت : « ئاخ وەلات نەزانینێ تو ژ دەست مە کری » • پاشی دگەل هەڤالێ خو یێ هێژا عبدالکریم ئەفەندی دزڤریڤە مال و گازی سترانبێژێ دەنگ خۆش و ناڤدار سعید ئاغایێ جزیری دکر ژێرا دستراند

---

(١) المهندس صلاح سعدالله ، کردستان والحرکة الوطنیة الکردیة ص ( ٣٢ ـ ٣٣ ) •

ئانكو ستران دگۆتن • ئەو جەلادەتێ پڕدویم شورٍ و تنگژی وەكی سولینا گولێ گەش دبوڤە پاشی سەعید ئاغایی دەست ددا بنگوهێ خو ڤێردكره ستران و لاڤژێت دل ڤەكەر ئێك ل دوی یا دی ددانە پەی ، نەمازە سترائێت مێرخاسی ، مێرینی ، عەگیدی و خورتینییا وان دگۆتن • دگۆت : جەعفو ڤەهەوەكێ تێكە [۲] •

بەهەشتی هەر وەكی دیارە ژ ئاخوینكا راهێلایی چەند جارا ل دوی ئێك دگۆتی : « ئاخ وەلات نەزانینێ تو ژدەستێ مەكری » و ژ گۆتنێت یوسف مەلەكی د كتێبوكا ب ناڤێ : ذكری الامیر جەلادەت بەدرخان (۱۸۹۷ — ۱۹۵۱ ) [۳] •

بەهەشتی پاشی ژ بنێ گوهی رۆژا (۲۵)ێ تەباخا سالا (۱۹۳۰)ێ ل دمەشقێ ل وەلاتێ سوریێ ئێوربوبی ، چەند بێژی یێ رویت و دەست تەنگ بویە ، ژبەركو هەبی و نەبێ وان د مشەختییێدا چۆ ، پویچ و پەلاچە بو • چو ژ زەڤی و زارێت وان ژی ل جزیرێ بو نەدهات ، نەمازە پاشی دەولەتا عوسمانی سالا (۱۹۲٤)ێ نەمایی و ئەتاتورك بویە خوكەرێ خوسەر نەدهێلا چو ژ بەرێ ملكێ وان بگەهتێ • ئەو پارێ كێم یێ كو فرەنسای ل سوریێ بو تەرخانكری ئانكو ڤەبرِی كو بدەنێ ، نەڤیایە وەربگریت ژبەركو دەبارا وی پێ نەهاتیە ، چو برین پێ نەهاتینە دەرمانكرن • هەر وەسا ژی قاییل نەبویە ببتە وەزیرێ راسپێرەرێ (مفوضێ) ئێرانێ ل دەولەتەكا ئەوروپایی و شێلم شرینییا حكومەتا جمهوریەتا توركی بو دكر كو دلێ وی یێ بریندار و ب كۆڤان خوشكەتەڤە پشت گوهـ ڤە دهاتە هاڤێتن ، ژبەركو بریارا دویماهیێ

(۲) رۆژەكێ ل مالا مە ل بەغدا ل ۱۹۷۹/۲/۲۷ێ چاخێ ئەم ب ژینەنیگارا ناڤبری د پەیڤین •

(۳) منصور شلیطا ، یوسف ملك : ذكری الامیر جەلادت بدرخان (۱۸۹۷ — ۱۹۵۱) بیروت (۱۵) تموز ( ۱۹۵۲ ص ۱٤ ) •

دابو کو خو ژ بندەستيێ دوير بێخيت • د دەمێ کو ملەتێ کوردێ د وێ سخنتي و تەنگاڤيێا مەزن ياکو د مان و نەمانێدا دژی • ئەگەرچی پاشی چەند سالا ژ دەست تەنگيێا خو دەرسداریێ زمانێ فرەنسی بویە د خويندنگەها پیشسازی (سنعەتی) ل شامێ سالا (١٩٣٦)ێ و د سالا (١٩٣٩)ێ ژی ئەدڤوکاتێ (مەحاميێ) کومپانيێا ئەلريژی بو و سەروکێ پشکنڤاتيێت (مفەتشێت) وێ کومپانيێ بویە [٤] •

مەزنی و خەمخوری و دلسۆژيێا بەهەشتی بو وەلات و ملەتێ کورد ژ بزاڤ و خەباتا وی یا بێ راوەستان دیار و ئەشکەرا دبیت • ئەو کورێ ئەمين عالی بێ کو پاشا ل ستامبولێ ، پایتەختێ دەولەتا عوسمانی د کوچك و قەسرێت پاشادا ييت تژی ناڤدەست و بسپوری دژی ، خارن و ڤەخارن و لەیزتن ، خودانکرنەکا چەوا دل حەز بکەت و رابيرانەکا ئێکجار خۆش یا دەڤ بکەنی و گورمژین ، پڕ هیڤی و هومێد ، ژ نشکەکێڤە بێتە گوهورين، مشەخت ببیت ، ب دنيایێ بکەڤیت پێیەك ل قاهرێ ل نك بابێ مشەخت ، پێ دی د گەل برایی ل ئەلمانیایی بێ کار ، هەتا ژ بنێ گوهی و دەست کورتی مالا رەنگ بکەت و پالەتيێ بکەت ژبو بەرهەڤکرنا پاريێ نانی و خويندنێ هەتا کو ب دویماهی ئینای • لێ بدەت بێتە باژێرێ دمەشقێ د ئۆدەکا تەنگ و کێم روناهی ، ب شەه و بن بیڤ و نزم د تاخێ شوهەدا ل سەر رێکا صالحیێ بژیت [٥] ؟ ! وێ ئۆدێ ژی بکەتە کتێبخانە ، دیوانخانە و ئۆدا ڤستنێ یا بەر وەخت • هەر وێ ئۆدێ بکەتە کارگێڕا ڤيسينا گۆتار و بەرهەڤکرنا گۆتارێت کۆڤارا هاوارا رەنگین یاکو ب بزاڤا خو یا کەسی شيایی فەرمانا بەلاڤکرنا وێ وەرگریت پاشی دو سالا و ب دەستێ خو ژی ببەتە چاپخانێ چاپ بکەت •

---

(٤) ذكرى الأمير جلادت بدرخان المصدر السابق ـ ژێدەرێ بەرێ ـ •

(٥) ذكرى الأمير جلادت بدرخان ـ ژێدەرێ بەرێ ـ •

بەهەشتی د وێ ئۆدا نزم و تەنگدا گۆتارێت تێڤەل و گەلێر ، ژ کولتۆرێ کوردی ، ژ زمانی ، ژ تۆر و روشەنبیری‌یا گشکی ب ناڤێ خو ، ب ناڤێ هەرەکول ئەزیزان و گەلەك ناڤێت دژی وەکی باڤێ جەمشید ، خوەدێیێ هاوارێ هند • دڤیسین و چاپ دکرن •

ئەڤ مرۆڤە ب من وەرە ژ گەلەك لاڤە وەکی سەیدایێ احمدێ خانیێ نەمرە • هزر و بیر و باوەر ، هێز و ڤەژەن ، ژێهاتن و ژبەر خو دەرکەڤتنا خو ژ بو ملەتێ کورد یێ بێ کەس ، بێ سەمیان و بێ خودان تەرخان‌کربو • ژبەرکو گۆتنا ل سەر زارێ وی بو خویانیان و بیانیان گۆتی‌یە و ڤەگێرایە ئەڤەیە : هندی ئەز بمینم ئەز چۆخۆشی‌یا ب خو نابەم ژبەرکو زوربا ملەتێ مە یێ کورد بێ پشك و زرِ بەهرە ، دبن دەستێ دژمن و نەیارا ، زوردار و ستەمکارا ، بێ رویمەت و سەر شۆر دژین • ژ سەربەستی و سەرفەرازیێ بێ بەهرە ، هەتا خو ب زمانێ ماکێ زمانێ کوردی ژی بخوینن و بنڤیسن یان ب سەربەستی پێ باخڤن [٦] •

بەهەشتی وەکی سەیدایێ خانی نەزانین یا دناڤ ملەتێ کورددا بەلاڤ ب ئاستەنگا ژ هەمیا مەستر یا پاشکەڤتن و پاشڤەمانا ملەتی دایە قەلەمی ؛ ب پەژیکا سەرگردانی و بەلەنگازی و چونەبونیێ هژمارتی‌یە • ژبەر هندێ ژی پێشڤەچۆن ب ڤەبراندنا نەزانینێ‌ڤە بەندکریە • هەکە هات و ئەو پەژیك نەهێلا ڤۆناغێت پێشڤەچۆنێ دێ کورت بن و د ڤەبرِن •

هەر ژبەر هندێ ژی بەهەشتی بزاڤەکا خورت و ژ کەل و دژوار کریە کو هێز و ڤەژەن و ژێهاتنا خو و یا هەڤال و هەڤخوین و هەڤگورێت خو پێت چار نکار ژ بو بەلاڤکرنا زانینێ ب رێکا چاپەمەنیێ ، ب چاپکرنا رۆژنامە و کۆڤار و کتێبان تەرخان دکر •

---

(٦) ژ زاردەڤێ رەوش خانا کابانی‌یا بەهەشتی و بەرپەرێ (١٣)ێ ژ بیرهاتنا ناڤبری •

بەهەشتی یێ پوسپور و شەهرەزا بو د زمانێت روژهەلاتـا ناڤـین و رۆژئاڤایێ هەر وەکی هاتیە گۆتن ؛ دیت کو ژ بو نەهێلان و ڤەبراندنا نەزانینێ ب رێکا بەلاڤکرنا زانینێ ل ناڤ ملەتێ کورد چ ب روژنامەگەری و چاپکرنا ڤشتان یان ژی ب بەلاڤکرنا زمانێ کوردی دچیتە سەری • بەلێ زمـانێ کوردی کو زمانەکێ هند و ئوروپیە ب تیپێت عەرەبی نەمازە زارێ کرمانجی ناهێتە ڤیسین ب درستی و هویبوین (فێربوین) ژی ب ساناهی نـاهێتە دەست ؛ ژبەر هندێ ئەلفابێیەکا لاتینی بەرهەڤکر کو زمانێ کوردی پـێ بێتە ڤیسین پاشی بیر و باوەرێت چەند زمانزانێت کورد و بیانی دەرباری ئەلفابێیا خو یا وی دانای کو زمانێ کوردی ب هەمی زارێت وی بێ جودایی ب راستی و ساناهی پێ بێتە ڤیسین •

ژ بو دیارکرنا بزاڤ و خەباتا بەهەشتی د ڤی واریدا ئانکو بەرهەڤکرنا ئەلفابێیا لاتینی یا دانای و کۆڤار و ڤشت پێ چاپکرین و بەلاڤکرین و هێژ ئەلفابێیا وی بنیاتی ڤیسنێیە ژ دەرڤەی عیراق و ئیرانێ من وەسا ب بـاش زانی کو دو بەرپەرێت بەهەشتی ب پێشگوتنێ د سەرێ ڤشتا « روپەلێن ئەلفابێیا خو » یاکو سالا (١٩٣٢)ێ ل چاپخانا تەرەقی ل شامێ ب تیپێت لاتینی چاپکری ل بەر چاڤێت خوێندەڤانێت هێژا دانم •

بەهەشتی د پێشگوتنێدا دبێژیت : « ب شەش هەژمارێن هاوارێ[7] ئێن پێشین مە هن روپەلێن ئەلفابێ بەلاڤکربون • ب وان روپەلان مە هیمێ (بنگەهێ) ئەلفابێیا کوردی ددانی و ژ خوەندا (خویندەڤـانا) و زانایـێن کوردان فکرێن ( بیر و رایێت ) وان ل سەر ئەلفابێیێ پسیار دکرن • ژبـەر

(٧) ئەو شەش هژمار ب تیپیت عەرەبی‌نە و ئەلفابێ ب گۆتار تێدا بەلاڤکری‌نە هژمارا یەکێ بەر پەرێ (٣ ــ ٤)ێ ، هژمارا دووێ بەرپەرێ (٥ ــ ٦)ێ ، هژمارا سێ بەرپەرێ (٧)ێ ،هژمارا چارێ بەرپەرێ (٤)ێ ، هژمارا پێنجێ بەرپەرێ (٧)ێ ، هژمارا (٦)ێ ، بەرپەرێ (٦)ێ •

وان روپەلان (بەرپەڕان) سەد و پینجھ (١٥٠) دەست مابون (ژبەر مابون)• من دل نەکر (نەدا) ئەو روپەلێن ها وندا بین • من دانە هەڤ ( لێـــکدان ) و چەند روپەلێن دن ب سەر خستن ( ب سەرڤە بەردان ) ئو پێ کتێبۆکەك هاتە پێ ( پێك هات ) • ئەڤ کتێبوکا ها (هە) بیرا ئەلفابێیا کوردی ئایێشینــە (بەرێ)یە کو نڤشێن داویی (دویماهیێ) لێ دتێرن ئو پێ بزانن کو پێشیێــن وان د چ تونەیێ (چونەیێ)دا ئەلفابێیا پێشینێدا بون چاپکرن • ژبو پێکئانینا چەرمێ (جلدێ) وێ دڤیابو کو چەند روپەلێن دن بکەڤــن پێشیێ • ب ڤێ حێنجەتێ من دلکر ژ خوەندەڤانێن خوەڕا بەرپێکرنا ئەلفابێیا مە بێ کورتی گلی بکم (ل سەر باحڤم ) •

ئەلفابێیا هانێ کو ئیرو ئەم زمانێ خوە پێ دڤیسین پاشییا خەباتەکە سالێن درێژە • د سالا (١٩١٩)ێ دە مە دابو چیایێن مەلەتیێ • ئەم کەتبون ناڤ ئەشیرا (رەشوان) • مێجەر نوئێــل ئنگلیزەك ژی دگەل مە بو • مێجەر زارێ نیڤرو (سۆرانی) دزانی ، دخەبتی کو هینی (ڤێری) زارێ باکور ببە ، ئو ژ خوەڕا هەر تشت دڤیساندن • من ژی هن مەدهەلوك (سەرهاتی) ستران و چیرۆك بەرهەڤ دکرن :

جارنا (هندەجارا) مە ل ڤیسارێن خوە چاڤێن خو دگەڕاندن، دخوەندن و دگوهورین • من بالا خوە ددا مێجەر ب لێڤکرنەکە (ڤەحەجاندنەکا) بیانی ؛ لێ بێ دشواری (زەحمەت) دەستنڤیسا خوە دخوەند • لێ بەلێ ئەز هەتــا کو مــن (و ــ U ) ژ (وو ــ O ) ئو (ی ــ î ) ژ ( ێ ــ ê )
هتد • دەرخستن ( جوداکرن ) دکەتم بەر هەزار دشــواری • ما چمــان ؟ ژبەرکو مێجەر ب هەرفێن لاتینی ، لێ من ب حەرفێن عەرەبی دڤیساندن • سەر ڤێ یەکێ دجهدا من کەرارا (بڕیارا) خوەدا کو ئەز ژ خوەرا ب حەرفێن لاتینی ئەلفابێیەك لێکانی (پێك ئینا) • ئێدن منی بکاریا دەستنڤیسا خــوە

پاشی هەزار سالی ژی بێ دشواری و وەکە خوە بخوینم ، ژبەرکو هـەر دەنگ جهێ ل سەرکاغەزێ دهات راوەستاندن •

لەورا کو د ئەلفابێیا لاتینیێدا (٢٦) هەرفێن سەرخوە (خوسەر) هەنە ئو دزمانێ کوردیێدا دەنگ ژ بیست و شەشان بێترن • گەلـەك هەرفێـن هەڤەدودانی (دودەنگی) کەتبون ناڤ ئەلفابێیا من وەکو (چ) ، (ۆ) و (ێ) •

ژ خوە د زاروتییا خوەدا وەکی من د دبستانـاندا (خویندنگەهـان) دخوەند ئو هینی حەرفێن عەرەبی و لاتینی دبوم تشتەك هەبو کو من د چاڤێ خوەرا دکر (ددیت) و ژ بونا هەرفێن عەرەبی ددلێ خوەدا دگۆت : « ئەڤ ئەلفابێیەك وەلێیە کو دەنگن ددەخوەندن (تێنە خویندن) کو نایێنە تڤیساندن، ئو لاتینی یەکجا ڤاژی (بەروڤاژی) وێ یە • هەرفن ددە تڤیساندن کو نایـنـە خوەنـدن •

بەلێ هزرا من د بابەتا ڤان هەر دو ئەلفابێیاندا ئەڤەبو ، باوەر بـکە ب ڤێ هزرا کو من ژ زاروتییا خوەڤە د سۆرێ خوەدا ( د مەژیێ خودا) ب خوە دکر کێتا (ئێمناهیا) من ژ هەرڤێن هەڤەدودانیرە نەدهات •

هنگی ژ زمانێن کو ب هەرفێن عەرەبی نایێنە تڤیسـاندن ، من یونانی هنگی فرەنسزی ئو ئەلفابێیا روسی ناسدکرن • هەما د جیێدا (دجهدا) ئەز رابوم هەرچی هەرفێن هەڤەدودانی ژ ئەلفابێیا خوە دەرخستن ئـو ل شوینا وان ژ ئەلفابێیا یونانی و روسی هەرفێن سەر خوە ئێخستن •

ب ڤی ئاوایی من ئەلفابێیەك ب سەهـ و شەش هەرفێن سەرخوە ئێخستن بو دەسـتێ خوە •

وەکی ئەم ڤەگەریان هاتن ستەمبولێ ب ڤێ ئەلفابێیـا من کتێبـەکە ئەلفابێ ئو فەرهەنگەکە کچك تڤیساند ئو ژ بونا چاپێ کارکری بون • لـێ مخابن نە ئەو ئەلفابێ نەژی ئەو فەرهەنگ ئیرو نەددەستێ من دانە • د سـالا

(١٩٢٥)يدا دگەل هن ڤيسارێن من ئێن دن (دی) گەهشتن هەتا پێشبەرێ مەحکەما خەرپوتێ •

سالا (١٩٢٤)يدا ل ئەلمانيايێ من جارەکە دن چاڤێ خوە ل ئەلفابێيا خوە گەراند ، هور لێ مێزەکر و دەمەکێ خوە ل سەر خەبتيم • من بالا خوە ددا و ددیت کو ئەڤ سێ تەخليت هەرف هەنە ل هەڤ نەدهاتن • هەرفێن يونانی و روسی يەك رەنگیيا ئەلفابێيێ خراب دکرن • ژ وێ پێڤە تێدا دو هەرف هەبون کو ژ مەڕا نەگەرەك بون • ژ لەورا من ئەلفابێيا خوە ژ نوڤە ب سەر و بەرکر • هەرفێن ژێ ئاڤێتن هن هەرفێن لاتينی بلند دەنگ ل وان بارکرن ئو د شوينا هەرفێن يونانی و روسی دائێخستن • ب ڤی ئاوايی ئەلفابێيەکە ب سهـ و چار هەرفان و يەك رەنگ هاتە پێ (پێك هات) •

ئەز پاشی ژێ ب ئەلفابێيا خوە مژول دبوم • لێ هەتانی کو ترك ئەلفابێيا خوە بەلاڤکرن يا مە وەکی خو دما و تێدا مە تشتەکی بنگەهی نەگوهارت • من هەر تشتێن خوە پێ ڤيساندن و ژناسێن خوەڕا ددازانين • وەکی ترك ئەلفابێيا خوە بەلاڤکرن مە ديت کو ددەنگێن هن هەرفاندا ئەلفابێ يێن مە نەمينا هەڤن • دەنگن هەبون کو ترکا نە ب وانهەرفێن کو مە نيشانکرنە لێ ب هەرفێن دن نيشانکريبون •

هەر وەکی مە بەرێ چە ندجارا گۆتبو ، ژ بونا هێسانکرنا (ساناهيکرنا) خوەندنا ڤيسارێن مە ژ کوردمانجێن ترکيڕا ، مە دەنگێن هن حەرفان ب هەڤ ( پێك ) گوهارتن ئو هەر چەند هەبو مە ئەو چەند ژ ئەلفابێيا خوە خست (راکر) نێزيکی ئەلفابێيا ترکان کر •

ژ گۆتنێن ژۆرين قەنج خويا دبە کو ئەلفابێيا مە پاشيا خەباتەکە سيزدە سالينە گۆرا زمانێ کوردی ، گۆرا دەنگێن زمانێ مەيە •

هەرێ ئەڤ ئەلفابێ بەری سێزدە سالان هاتيە ڤيساندن ئو گورا زمێن

(زمان) و دەنگێن وی هین ب هین هاتە گوهارتن ئو کەت هالێ ( جۆرێ ) خـــوە ئێ ئیرو •

بەری و پشتی بەلاڤکرنا ئەلفابێیێ من هزرێن گەلەك کەسان پرسین و گوتنێن هنەکان ب کێری من هاتن • د ناڤ واندا مرۆڤێن یەکجار نەخوەندا ژی بون •

ژ لەورا ئەز ڤێ ئەلفابێیێ ژ کەدا (رەنجا) خوە بێتر کەدا ملەتێ خـــوە دهەسبینم و پێشکێشی وی دکم •

ژ خوە هەرچیێ هـــەیی یێ وییـــە ژ یێ هـــەر کەســـەکی هێـــژاتر و سپەهیـــترە [٨] •

شـــام : تاخـــا کوردان
( ٢٨ ) چریا پاشێ ١٩٣٢
جەلادەت عالی بەدرخان

ژوێ پێشگۆتنا نەمر جەلادەتی د سەرێ تڤشتا روپەلێن ئەلفابێیـــا سالا (١٩٣٢)یێ ل شامێ چاپکری و بەلاڤکری دیار و خویا دبیت کو بەهەشتی بزاڤەکا ل سەرخو یا پڕ ئاستەنگ و سختی و دژوار کرییە و دویربـــین ژی بویە هەتا کو ئەلفابێیا خو ب سەرێکڤە ئینایە و بەر دەست کرییە و بویـــە ئەلفابێیا کوردی لاتینی ، رۆژنامە ، کۆڤار ، تڤشت و فەرهەنگ گۆتـــار و تویژاندن ل سوریێ ، ل لبنانی ، ل کوردستانا تورکی و ئێکەتیا سوڤێتی و ل ئەوروپایی پێ تڤیسینە و چاپکرینە و پێ ژی دتڤیسن و چاپ دکەن •

تشتێ پێتڤی گۆتن ئەڤەیە ، پاشی شورشـــا ئوکتوبـــەرێ ل وەلاتێ ئویرسی ، کوردێت روپێبلیکا ـــ جەمهوریەتا ـــ ئەرمەنستانێ رێ ل بـــەر

---

Rupelinên Elfabé , Kitêbxana Hawaré Hejmar (2) Capxana Terqî, Sham 1932. Pêsgotink.

کوردێت وێرێ هاته ڤەکرن کو ب زمانێ کوردی بخوینن هەتا دەرسخانـا شەشێ پاشی هەتا دەرسخانا هەشتێ • ژبو بجهئینانا وێ چەندێ ئەلفەبێیەکا کرمانجی ژ لایێ زانا و زمانزانێ ئەرمەنی مورو گولوف ر• درەپێیان سـالا (١٩٣١)ێ هاتە دانان و چاپـکرن [٩] • هژمـارەکا ب تنـێ ژ ئەلفابێیـا موروگولوڤی د نامەخانا (کتێبخانا) جاسمێ جەلیلدا ل یەرەڤانێ پایتەختێ ئەرمەنستانا سوڤیتیدا هەیە • رۆژا (١٩٧٤/١/٢٦)ێ دەمێ کو ئەم سـێ ڤیسەڤانێت کورد گازیکرینە تێشتێ جاسمی نیشا مەدا دگەل ئەتلەسـەکا کوردی ب تیپێت لاتینی • ئەڤ ئەلفابێیا لاتینی ل دوی گۆتنـا جـاسمێ جەلیل هەتا سالا (١٩٣٨)ێ د خویندنگەهێت کوردی ل ئەرمەنستانا سوڤیتی ل دەرسخانا یەکێ دهاتە خویندن • پاشی بریار هاتە دان کو ئەلفابێیـەکا کوردی ب تیپێت روسی بێتە بەرهەڤکرن ، چاپکرن و خویندن • هەتا نهو ژی کتێب ، گۆتار و رۆژناما رێیا تـەزە Rêya Teze ب وان تیپـان ئانکو تیپێت روسی تێنە ڤیسین و چاپکرن •

ل دوی گۆتنا جاسمێ جەلیل د رۆژا ناڤبریدا ، ئەلفابێیا جەلادەت بەدرخانی گەلەك ژ ئەلفابێیا اسحاق موروگولوڤی باشترە • کرمانجی باشتر پێ تێنە ڤیسین • نهو ل ئێکەتیا سوڤیتی ڤشتێت زانستی و فولکلوری ب ئەلفابێیا نەمر جەلادەت بەدرخانی تێنە ڤیسین و چاپکرن •

مامۆستا توفیق وهبی ژی پاشی بەلاڤبونا ئەلفابێیا نەمر جـەلادەت بەدرخانی ، ل سالا (١٩٣٣)ێ کتێبوکەك ب نـاڤی «خوینـدەواری بـاو» بەلاڤکر • هەر بیست و شەش (٢٦) تیپێت ئنگلیزی کرنە بنگەهێ ئەلفبێیا خو یا کوردی ب سەرڤە بەردانا پێنج (٥) تیپان یێت کو ب ناڤێ دو پیـتی ب ناڤکری وەك ( چ Gh ) ب درسـتی وەکی ئنگـلیزی بێ کێـم و

---

(٩) Morogulov, R. Direpêyan , Elifba Kirmancî 1931.

زێـــده • ( غ gh ) ( ڵ Lh ) و ( ڕ Rh ) یا دەنگ‌بۆڕ و (ش Sh )
وەکی زمانێ ئنگلیزی ب درستی •

بەلێ ئەڤ ئەلفبێیا ناڤبری یاکو سەر ب ئنگلیزیڤە پشت گوهـڤە هاتە هاڤێتن ژبەرکو ل عیراقێ کەسێ چو پێ نەڤیسی نە رۆژنامە نە کۆڤار نەژی نڤشت ؛ ب تیپێت عەرەبی نڤشت ، رۆژنامە و کۆڤار هاتنە بەلاڤکرن ، ژ هنگی وەرە و هەتا نهو ژی کو هەر چەند بەر پەرێت وێ ما نـــە د نامەخانێت هندە کەســـاندا •

ژ بلی وێ ژی مامۆستا جەمال نەبەزی کتێبۆکەك ب ناڤێ « نوسینی کوردی بەلاتینی » دانا • چەند گوهورین د ئەلفابێیا بەهەشتیدا کرن وەکی دەنگێ (ڵ) و (ڕ) یا ســـتویر و دەنگدێرا (ڤاولا) ئوێ • بەلێ دیسا پشـــت گوهـڤە هاتە هاڤێتن • کەسێ ب بانگێ وێ ڤێژ نەکر و ب کار نەئینا •

نەمر گیو موکریانی ژی : «ئەلف و بێی کوردی وێنەدار بە تیپی‌لاتینی» سالا (١٩٧٢)ێ بەلاڤکر • بەلێ دیسا کەسێ گەهـ نەدایێ و ژ وان هەمیان ئەلفابێیا نەمر جەلادەت بەدرخانی ب ناڤ و دەنگ و ل کارە ـــ ب کار تێت ـــ ژ دەرڤەی عیراق و ئیرانێ کو کوردی زارێ سۆرانی خاسما ب تیپێت عەرەبی تێنە ڤیسین • ب من وەرە ئەلفابێیا جەلادەت بەدرخانی ئەلفابێیا پاشە رۆژا ملەتێ کوردە ، ژبەرکو زارێت کوردی بێ جودایی پێ تێنە ڤیسین •

ئەڤ کارێ مەزن یێ کو نەمر جەلادەت بەدرخانی ب سەرێکڤە ئینایی کو بەردەســـتکرنا ئەلفابێیەکا لاتینی‌یە ب من وەرە ل ســـەر رێچا بۆچۆنا سەیدایێ مەزن خانیێ نەمرە ، کو زانینێ ب کورترین و سڤکترین ئاوا و رێ ل ناڤ ملەتێ کورد بەلاڤکەت •

هنگی خانیێ نەمر بو ، هنـــدی بێژی مرۆڤەکێ دویربین بـــو ، پاشی

هزرکرنەکا ل سەرخو بو روهن و روشەنبو کو زمانێ عەرەبی زمانێ ئۆلی و ئایینی و خویندنێ‌یە د خویندنگەهێت کوردی‌دا • زانینا وی ژی پێ‌تڤی‌یــە ژبو تێ‌گەهشتنا زانستێت ئۆلی ئانکو (علومێت دینی) وەکی قرآن ، حدیث و فقه و زانستێت دی • ژ بو سڤك‌کرن و زوی تێگەهشتنا زمانێ عەرەبی ل بەر بچویکێت کورد ، خانی نوبیهار ڤەهاند داکو زاروکێت کورد بشــێن (بکارن) ژبەرکەن و زمانێ عەرەبی پێ ب گرێ ل بەر سڤك بیت و بابەتێت ب زمانێ عەرەبی د خوینن تێ‌بگەهن و شەهرەزایی ئەموژگاری یێت خانی د نوبیهارێدا بین • کو ب وێ چەندێ رێــکا راست یا ژین و ژیارێ ل بــەر روهن و روشەنبیت • هەر ژبەر هندێ ژی خانیێ نەمر د سەرێ نوبیهارێ‌دا گۆتیــە :

**نه ژ بو صاحب رەواجان**
**بەلکه ژ بو بچویکێت کرمانجان**
**وەکی ژ قرآنێ خلاس بن**
**لازمه ل سەوادی چاڤ ناس بن**

هەر وەسا د سەرێ دەریایێت ( بەحرێت ) نوبیهارێدا ئەموژکاری یێت سەیدایێ خانی یێ مەزنن وەك :

**١ ـ هەتا تو دەور و دەرسان نەکی تکرار و مصروف**
**د دنیایی تو نابی نەمەشهور و نەمەعروف •**

**٢ ـ هەرچی ب علمی جەهل کر موبەدەل ( مبدّل )**
**سفرێ خو وی کر ب زێر موکەلەل ( مکلّل ) •**

**٣ ـ گەر تە دڤێتن تو ببی میر و سەر و موعتەبەر**
**کذب و خلافێ مە بێژ گەر تە بکن کەر بکەر •**

**٤ ـ گەر تە دڤێتن کو بەرابەر نەبتن کەس ب تەرا**
**علمی بخون هەم عەمەلی تو بکە صنعەت ژ خورا •**

**٥ ـ ( معلّم ) بلا دل وەك بەربتن**
**دڤێتن کو شاگرد دلبەربتن •**

ئەمر جەلادەت بەدرخانی ژی ب دویربینی‌یا خو زانی کو ژ بو نەهێلانا نەزانینێ یا وەکی پەنجەشێرێ‌یە د ناف ملەتێ کوردا بەلاڤبویی و بویە ئاستەنگ درێکا پێشڤەچونا وی‌دا ؛ ب بەلاڤکرنا زانینێ نەبیت ناهێتە چارەسەرکرن • بەلاڤکرنا زانینێ ژی بو ملەتێت وەکی ملەتێ کورد ب رێکا ڤیسینا زمانێ کوردی ب تیپێت لاتینی نەبت ناچیتە سەری ؛ ژبەرکو ڤیسینا زمانێ کوردی ب تیپێت لاتینی زویتر و باشتر ب دەستڤە تێت ، چکو چەند دەنگ یا فونێم د زمانێ کوردی‌دا ب تیپێت عەرەبی ناهێنە ڤیسین و زاروکێت کورد ژی ل تورکیای ب تیپێت لاتینی دخونین و دڤیسن ، نەشێن ( نکارن ) کتێبێت کوردی یان روژنامە و کوڤارێت ب تیپێت عەرەبی تێنە ڤیسین بخوینن • هەکە هات و وەکی بەرێ ب تیپێت عەرەبی هاتنە ڤیسین دێ روشەبیرێت کورد ب درستی بێ بەهرە بن خاسما ناڤێ « کورد » ئینان ل تورکیای قەدەغەیە ئانکو نابیت بێتە ئینان ل سەر سیاسەتا تورکیا ل سەر دچیت • هەر ژبەر هندێ ژی بەهەشتی ئەلفابێ‌یا راست دانایی ژ بنێ گوهی تێزیکی ئەلفبێیا تورکی کر داکو کوردێت تورکی بخوینن و تێ بگەهن • هەر ژبەر هندێ‌یە ژی کوردێت تورکی ژ چاپەمەنی یێت کوردی ل عیراقێ زربەهرن •

سەیدایێ خانی یێ ئەمر چەند خەمخورێ ملەتێ کورد بویە ، بارێ ملەتێ کورد یێ پاشکەڤتی و دەست گرێدایی وەکی پەلیڤانێت زراف ستویر و عەگیدێت هێژا مل د بنڕا بربون ، بزاف و خەباتا خو ل سەر خو و هوشمەندانە سست نەکری‌یە •

جەلادەتێ ئەمر ژی د وی دەراڤێ ئالوزیایی و تەنگ و پڕ ئاستەنگ ، مشەخت ل وەلاتەکێ بیانی یێ کێم هاریکار و پشتگر و پشتەڤان ، د دەستەنگی و چونەیێ‌دا ژی ، دیسا بزاف و خەباتەکا ل سەرێك یا خورت و دژوار ، بێ راوەستان و ماندیبوینی هەر کریە • هەیی و نەیێ خو ، هێز و ڤەژەن ، زانستی و روشەنبیریا خو ژبو سەرفەرازی و سەربلندی و رویمەتیا

ملەتێ خو یێ تەڕا بەڕا کری ، ژار و مشەخت و بەلەنگازکری مەزخاندی‌یە • ئەڤە ژبلی بزاڤا د زڕکورینی ، تۆلازی و خورتی‌یا خودا کری ، د هەڤبشبوینا وی دجڤاتێت سەربەستی و ئازادیێدا وەکی جڤاتا ئێکاتی و بلندبوینی‌یا وەلاتی (جمعیة الاتحاد والترقی) و جڤاتێت کوردی ل ستەمبولێ و جڤاتا خویبون و بزاڤێت دی‌دا ل ئەلمانیایی و شورشا شـێخ سەعیدێ پیران یێ نەمر سـالا (١٩٢٥)ێ کو ژ ئەندامێت هێژا و ب بزاڤ بویە •

ل دوی گۆتنا هەڤال و هەڤگور ، نیاس و تێکەلێت جەلادەت بەدرخانێ نەمر بەهەشتی مرۆڤەکێ وەسا جامێر و بالبەر و خوشـمرۆڤ بویە مرۆڤاتی ژێ وەریایە هنگی هندێ شرین مرۆڤ و مرۆڤاتی پەروەر بویە • د دەڤێ ویڕا نەهاتیە چو جارا و نەژی ژ کەسێ بهیستی‌یە کو وی مرۆڤ و ئەبدالێ خودێ نەکامی‌یا کەسێ کر بیت ، چ دوست و برادەر ، هەڤخوین و هەڤنەژاد بت یان ژی بیانی ودوژمن و نەیاربت • ژبەر هندێ وەکی وان کەسان بویە یێت کو ب دلۆڤانێ هەمی کەسان بویـە • ب چاڤەکێ دلۆڤانی ، مرۆڤ پەروەری و دلسۆژانە تەماشەی ملەتێت جیهان و مرۆڤاتیێ کریە •

کابانیا وی رەوشەن خان کچا صالحێ بەدرخانی دبێژیت : نەمر جەلادەت وەسا دلسۆژ و دلۆڤان بو ، هەمی کەس خویانی و بیانی ل نـك وی وەکی کەس و کارێت خو ددانە قەلەمی و تێکەلیا وان دکر و دگەل دژی و رادبارت • چەند ب ملەتێ کوردڤە بەستی بو و وەکی نۆژێ پێڤە گرێدایی یان کۆرێ کێچ گرتیێ هند ژی ئەڤیندار و دلۆڤان بو ؛ نەرم ، ئاخفتنخۆش و ب رویمەت بـو دگەل دژمن ونەیارا • جو جارا گۆزەك شکێن و ئاخفتن رەق و سەرهشـك دگەل وان نەبویە ؛ ژبەر هندێ هەڤال و هەڤگور ، دوست و برادەر ، نیاس و تێکەلێت وی ژ هەمی ملەت و نەژادان بوینە • دەستێ هاریکاریێ و دەست گرتنێ بو دوژمن و نەیارێت خو ژی درێژ دکر ؛ ژبەرکو نەدشیا پاتکا خو ب دەتە ئێکێ پێ‌تڤی وی یان ژی ب سەرگوهڤە پاڤێت پویتە پێ نەکەت • هندی

بێژی دویربین ، بێهن فرەهـ و ب حەوسەلە بویە • دەست درێژی ، ئاخفتنێت نەژرەنگ و رەق دادعویران و چو جارا ب خو نەتینا دەر ئانکو خو دیار نەدکر کو ژیەکی دل مایی ، بوغومی ، پوسیدە یان ژی تنگژییە ، نەژی هزرا تول ستاندنێ ژ یەکی کرییە [۱۰] •

بەهەشتی مرۆڤەکێ جان سڤك بویە ، د خو دا ئاڤا نەبویە • خو ل سەر کەسێ مەزن نەکریە ، نەژی ب خو ب زانست و روشەنبیرییا خو و ب بنـە مالا خو نەخورییە • هەمی کەس زانا و نەزان ، ژار و رویت و دەست کورت دەولەمەند ، بچویك و مەزن ، هەر ئێکی ل دوی دلێ وی دگەل رابێرایـە و کریە تێکەل و برادەر •

نەمر جەلادەت بەدرخان ئەگەرچی دەست تەنگ ژی بویە مالا وی ل سەرێك قوناغ و ئێورگەها هەمی کەسان بویە ، هەتا خو یوگوسـلاڤی و ئەلمان ژی پاشی شەرێ دووێ جیهانی یێت کو هاتینە سوریێ ل سەرێك سەرا وی ددا و رێ بو گرفتاری یێت وان ددیتن و هەر دو لا پێك تینان خاسـما هەکو دبـو گێنگەشـە و هنگاما وان ب چـو ئاوایان نەدشـیان بگەهنە ئـەنجامەکێ •

پاشی رەوشەن خان دبێژیت : شازدە (۱٦) سالا ئەز هەڤگیانا وی بوم ب گوهـ من نەکەڤت کو وی گوبین و ئەبدالێ خودێ کیماسی یێت کەسەکی بەر روی وی کرین ، یان ژی پێ ئاخفت بیت ، گۆتبیت بێهڤان کەسی ئەڤ

(۱۰) رەوشەن خان ژ خویندەڤانێت دەستهاتییە د زمانێ کوردی ، عەرەبی ، فرەنسی و تورکیدا . چەند نڤشت ژ تورکی وەرگێرانیە زمانێ عەرەبی ژ وان کتێبان « غرامی وآلامی » و چەند ژ تۆرێ کوردی وەرگێرایە عەرەبی ب ناڤێ صفحات من الأدب الكردی ، چاپ کرییە ژبلی «مذكرات معلمة» کو سێ جزمن . چەند گوتار د هاوارێدا ب کوردی بەلاڤکرینە ، دچەند کونفرەنسادا ب ناڤێ ملەتێ کورد هەڤبشکی کریە . پشتەڤانەکا دلسۆژ و دەستهاتییەکا ژ بەر خو دەرکەڤتی یا هەڤگیانی خو و ملەتێ کوردە .

کیماسی‌یه ل نك هه‌یه • به‌لێ به‌روڤاژی وێ چه‌ندێ بو ب درستی • به‌هه‌شتی ئه‌دڤوکاتێ یا پارێزه‌رێ هه‌می که‌سان بو بێ جودایی • هه‌که جاره‌کێ ڤیابا ئێکی بینته سه‌ر رێیا راست یان ژی کیماسیه‌کا وی دیار بکه‌ت ، دا ب تنێ لسه‌ر خوو ب نه‌رمی دگه‌ل ئاخفیت وه‌لێ که‌ت کو ئه‌و ب خو ژ کار و کریارێت کرین و دکه‌ت شه‌رم بکه‌ت • پاشی دبێژیت : ئه‌گه‌رچی سایکولوجی و زانستێ په‌روه‌رده‌کرنێ نه‌خویندبو ، لێ ئه‌و ب خو ب ره‌وشت و سنج و سه‌ر و به‌رێت خو وه‌کی سه‌یدایه‌کێ پوسپور و شه‌هره‌زابو • رێکا راست نیشا هه‌می که‌سان ددا • پارێ نانی دگه‌روییێ‌دا نه‌دچو خارێ هه‌که باهرا ژار و رویت ده‌ست‌کورتا تێدا نه‌با • هه‌ر ژبه‌ر هندێ ژی ب سه‌دان ژن و مێر ، هه‌ڤال و هه‌ڤگور ، دوست و تێکه‌ل و نیاسان روندك بو دباراندن و چیرۆکێت بالبه‌ری ، جامێری و خوشمرۆڤیا وی دگێران کو گه‌له‌ك ژێ خو من ژی ئه‌ز هه‌ڤگیانا وی بوم من نه‌دزانین •

ژبو دیارکرنا ڤێ راستی و خوشمروڤی‌یا وی ، دێ ڤان چه‌ند مالکێت هۆزانی بێت (محمد تیسیر القنواتی) ب ناڤی تاخێ موهاجرین (حی المهاجرین) ل دمه‌شقێ رۆژا دویری ژ ڤارا له‌شی پاکژی به‌هه‌شتی د (١٦/٧/١٩٥١)ێ بریه گۆرستانێ خویندی ل به‌ر چاڤان دانین :

**العلم بـاك والنـهى ولهـان**
**والشام أضنـت قلبهـا الاحزان**

**والفضل ينـدب حظـه لمصـابه**
**وبلائــه وجـزاؤه الحرمـان**

**لو أن سهـم الموت حـلّ بغير من**
**تحيـا و تنهض فيهـم الأوطـان**

**لغدا مصـاب اليـوم أمراً هيّنـا**
**ووجـوده سيــان و الفقـدان**

**لكن هـذا الخطب حلّ بمخلـص**
**شـهم كريـم فقــده خسران**

لا غرو ان تبــكى عليه بلادنــا
و لقــد بكاه الفضل و العرفــان

لاغرو ان تبــكى عليــه قلوبنــا
و لقــد بكاه الشيب و الشبــان

يــارب حسب بلادنــا مانابهــا
فارحــم وانت الواحــد الرحمن
وامنــن بســلوان لاهليــه فقــد

عــزّ التصــبر فيه والسلوان •

برادەر صــبری احمد بۆتانی ژ زار دەڤێ هۆزاڤانێ جەگەر و هناڤ کوزریێ ناڤدار سەیدایێ جەگەرخوینی گۆت : جەگەرخوینی ل ســەرێك دگۆت :

هندی ئەزم ئەز چو جارا چاکییا بەهەشتی جەلادەت بەدرخانی ژبــیر ناکەم • وی ناڤ و توی دمن ددان و هاریکارییا من ژ هەمی لاڤە دکر • ژبەر هندێ ئەز رۆژ بۆ رۆژی پێشدا دچۆم د ڤەهاندنا هۆزانا و تۆرێ کوردی و روشەنبیرییا گشکییا کوردی • گرۆڤێ ڤێ راستیێ بەلاڤکرنا هۆزانێت منن یێت کو د کۆڤارا هاوار و روناهیێدا • ژبلی چاپکرنا دیوانا من یا یەکێ دبن هژمارا (١٩)ێ ژ کتێبخانا هاوارێ • هەر وەسازی ئەز چەند پێتڤی باما چو جارا ژ جامێری ، دلۆڤانی و مروڤاتییا خو چاڤی خو ژ من نە دگرت • پاشی صەبری ڤێ سەرهاتیا جەگەرخوین و بەهەســتی ژ زار دەڤێ جەگەرخوینی ڤەدگێریت : گوت رۆژەکێ جەگەرخوین و جەلادەت دچنە بازارێ حەمیدیێ (سوق الحمیدیة) ل شامێ • نەمر جەلادەت دبێژتە جەگەرخوێنی ، هەر ئێك ژ مە دێ هۆزانەکێ ب بازارێ حەمیدیێ ڤــەهینت • پاشی ئەم هەر دو دێ هۆزانێت مە ڤەهاندین دەینە بەرێك ئانکو هەڤبەری ئێك کەین کانێ هۆزانا کێ ژ مە هەر دووا چێترە • پاشی ل سەر دارخازا بەهەشتی هەر دو هزرێت خو دکەن و هۆزانەکێ ل سەرکاغەزێ دنڤیســن • بەهەشــتی گاڤا هۆزانا

جەگەرخوینی ژێ وەرگرتی و خویندی ، هەر دجهدا هۆزانا خو یا ڤەهاندی دڕاند ، ژبەرکو دیت کو هۆزانا جەگەرخوینی ژ هۆزانا وی چێتر و سپەهیترە •

زانایێ ناڤدار و هۆزاڤانێ ژێهاتی ( نەمر قەدری جان ) د بیرهاتنا (یادا) یەکێ یا چۆنا بەهەشتی جەلادەت بەدرخانی ل بەر دلۆڤانییا خودێ دبێژیت : جارا ژ ریڤە من نەمر جەلادەت دیتی بەری (٢٠) سالا د ئۆدەکێ ڤەبو ، یێ ب دانانا رێزمانەکا کوردیڤە مژویلێ بو • ژ وێ چاڤ پێکەڤتنێ وەرە هەتا نهو ژی ئەز ب پیرۆزترین و هنەرمەندترین بیرهاتن ئانکو (یاد) دادنم کو کار د مندا کر بیت • دو سالا پاشی هنگی من دگەل بەهەشتی د کۆڤارا هاوارێدا کار دکر • ئەز ب درستی تێگەهشتم کانێ چ مرۆڤەکێ بەرکەڤتی و ژێهاتییە • ئەز چەند ب چاکی ، جامێری و بالبەرییا وی باخڤم ئەز نەشێم دویماهیێ پێ بینم و ب من ڤەژی ناهێت ئەز هەمی پەسنێت وی بەر روی بکەم • ئەڤینداریيا وی بو وەلاتێ وی کوردستانێ و پێڤە نوسیانا وی بو خورتێت ملەتێ وی یێ کورد ل نك هەمی کەسان دیار و ئەشکەرانە ، ژ رۆژا نیڤرو ئەشکەراترن • مرۆڤەك ب جەرگ و دلێربو • هندێ ئازا و خورت بو خو ژ چو نەددا پاش ، ددەم و چاخێت ئالۆز و نەخۆشی و تەنگاڤیدا • بەلێ ددەم و چاخ و هەیامێت بالبەرییدا چەند بێژی مرۆڤەکێ سڤك و نەرم و بێهن فرەهبو • بەهەشتی ئەگەرچی ژ کەڤنترین بنە مالا کوردبو ، بەلێ ب درستی دژی هەمی بیر و باوەر و بزاڤێت ئەرستوکراتیبو • سوشیەلیست پەروەربو و باوەری پێ دئینا • چەند بێژی مرۆڤەکێ مەزنبو ، ژبەرکو باوەری دئینا کو مرۆڤاتی مەزنترین باوەرییا بلندە چو ب سەرناکەڤیت • دلگەش و شاد و بەختیار دبو دەمێ کو ژ دەستی دهات هاریکارییا هەمی ژار و دەست کورتان دکر ، و جودایی د ناڤبەرا چو ئۆل (ئایین ــ دین) و نەژاد و توخم و تەخەرا نەدکر •

ژ نیا سێت بەهەشتی جەلادەت بەدرخانی حەسەنێ حاجوی بو، سەروکێ ئێلێ هەڤێرکان و هەڤکارێ وی بو د خەباتا مللیدا دبێژیت : نەمر جەلادەت بەدرخان جارا ژ رێڤە دمەها تیرمەها سالا (١٩٢٩)ێ بو ، من ل قامیشلی دیت• بەهەشتی خو بەرهەڤدکر کو ب گەهتە هێزێت مللیێت ل چیاییێت ئاراراتێ ب سەرکێشییا احسان نوری پاشایی شەردکر ، ژبەر هندێ هاتبو وێرێ • بەلێ پا هندی بزاڤکر کو بچیت پێ چێنەبو ؛ ژبەرکو بارو زروفێت تێدا رێ ب چو ئاوایا نەدایێ کو ب گەهتە ئامانجا ژبو هاتی •

د دیتن و چاف پێ کەڤتن ییت من دگەل بەهەشتی بو من دیار بو کو وەلاتپارێزەکێ بێ بەقلبو • زراڤستویر ، هێژا و دلێربو • ئەز ب جامێری ، بالبەری، خوشمرۆڤی و هوشمەمەندییا ویڤە بەندبوم• چاکی و هنەرمەندی ییت ڤی جامێری ب دەڤ ناهێنــە گۆتن هنــدی گەلەکن • نــەمر جەلادەت بەدرخان ژ وەلاتپارێزێت گەلەك مەزن بویە ییت کو ژین و ژیار ، هش و بیر و باوەر و زانستییــا خــو ژ بو نفش و وەلاتێ خــو تەرخانــکری • ئاخڤتن ، سوحبەت و گێنگەشێت وی هەمی ب جارەکێ ل ســەر وەلات و ملەت و نفشێ کوردی بون • ژ وێ چەندێ پێ ئاخڤتن و پێ ئاخڤتن ل سەر بنگەهێ درســتبوینا هەر بێژەکا کوردی کانێ ژ چ هاتیە دارژتن و چــەوا بێژییێت لێکداییی ژ ییێت خورِی (سادە) تێنە سازکرنێ ئانکو درستکرنێ ، ب جودی نەتاخڤت • هەکە خو مەهـ و سالا ژی ل سەر وێ چەندێ هاتبا پێ ئاخڤتن ژێ وەرس نەدبو • هەکە بێژەك ژی ژ وێ پێئاخڤتنێ یان گێنگەشێ ســاز ببا دابشکوریت و دا کورمژیت و دلگەش و بەختیار بیت ، هنــدێ ب زمانێ کوردیڤە بەند و گرێداییبو •

براســتی نــەمر جەلادەت مرۆڤــەکێ مروڤپەروەر ، وەلاتپــارێز و کوردپەروەربو ؛ هاریکار و پشتەڤان و پشتــگرێ رویــت و بــێ کەس و بەلەنگاز و بێسەمیانا بویــە •

